# گفتوگۆیەک لەگەڵ بابمدا

ئامادەکردنی: شەریف عەلی باپیر
خـەت : نەوزاد کۆیی
دیزاین : جمعە صدیق کاکە
چاپی یەکەم ١٤٤٢ ك - ٢٠٢١ ز

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٤١٠) ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە

# ئەم کتێبە و
# چەند قسەیەکی کورت

الحمد لله حق حمده والصلاة والسلام على عبده محمد وآله السائرين على دربه.

خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستت یەکەمین بەرهەمی ئامادەکراوی کاك شەریفی کوڕمە، پێکهاتووە لە بیست و پێنج (٢٥) تەوەر، بناغەی هەموو تەوەرەکان بریتییە لەو گفتوگۆیانەی نێوانمان، کە لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ڕابردوودا و دواتریش، ئەنجامدران. لە پاڵ بۆچوونەکانی خۆیدا، بۆ هەر تەوەرێك پرسیاری گرنگ و عاقڵانەی ئاڕاستەکردووم و، هیوداریشم لە قەدەر حاڵ و بوار وەڵامی باشیشیان درابنەوە.

دەستخۆشییش لە کاك شەریف دەکەم، هەم بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە "کە داهێنانی خۆی بوو"، هەم بۆ ڕەنج و

ماندووبوونەکەی کە بە تایپکردن و هەڵەچنیی و، چاوپێدا گێڕانەوەی چەند جارەی گفتوگۆ و کورتە وتارەکان، کێشاویەتی.

هەڵبەتە منیش لەسەر پێشنیاری کاك شەریف، بە وردیی پێیدا چوومەوەو، هیوادارم مایەی بەرچاوڕوونیی و هۆشیاریی بێ، بۆ گەنج و لاو و تازە پێگەیشتووانمان بە خوشک و براوە، ببێتە هۆکاری زیاتر تێگەیشتن و پێگەیشتنیان.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

**عەلی باپیر**
٢٧ / ٣ / ٢٠٢١ ز
١٤ شعبان ١٤٤٢ ک
هەولێر

# پێشەكیی

بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

سوپاس و ستاییش بۆ خوای پەروەردگار، خاوەنی جوانترین و بەرزترین سیفەتە بێسنوورەكان؛ بە ئەندازەی نزیكیمان لێیەوە، لە سیفەتە هەرە بەرز و جوانەكانی بەهرەمەند دەبین بەو ئەندازەیەی بۆ مرۆڤ گونجاوە.

خوێنەری سەنگین!

ئەم كتێبە لە سەرەتادا كۆمەڵێك پرسیاری بەندە و وەڵامی جەنابی بابم بوون، كە لەلای خۆم تۆمارم كردبوون، هەوڵدراوە ئەو گرفت و كێشە فیكریی و ڕووحییانەی لەم سەردەمەدا زەق و گرنگن، لێرەدا تیشكیان بخەینە سەر و، چارەسەری ڕاست و دروستیان بۆ بخەینە ڕوو. سەرەتای دەستپێكردنیش لە مانگی (٣)ی (٢٠٢٠) بوو، ئەوەندەی دەرفەت بۆ بابم ڕەخسابێ و

منیش سەرقاڵی ئیش و خوێندن نەبووبم، بە پچڕپچڕیی وانەکان تۆمارکراون کە تاکو مانگی (١١)ی (٢٠٢٠)ی خایەند. دوای بەدواداچوونم بۆ ئەم تەوەرە هەستیارانە و لە ژێر ڕۆشنایی وەڵامەکانی جەنابی بابم، کە خۆم تێیدا زۆر سوودمەند بووم، بە پێویستم زانی بیانخەمە دوو توێی کتێبێکەوە و ئێوەی بەڕێزیش لێی سوودمەندبن. بۆ هەر باسێك بۆچوونی خۆم بە گوشراویی خستۆتەڕوو، لەسەر هەمان باسیش بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکان، بۆچوونی جەنابی بابمم وەرگرتووە.

ئەو باسانەی لە کتێبەکەدا هەڵمبژاردوون، زۆر بە گرنگم زانیون بۆ ئەم ڕۆژگارەی ئێستا، تەوەرەکانی ئەم کتێبە بۆ من زۆر زیاترن لە گفتوگۆ، بەڵکو ڕێگاچارە و، کلیلی دەرگای داخراو و، چارەسەری زۆر گرێکوێرەی فیکریی و ڕووحیی ئەم سەردەمەن. زۆرجار بینیومە چۆن خەڵکی تووشی چەندان نەخۆشیی دەروونیی و جەستەیی بوون، بۆ وێنە: چۆن کەسانێك لە (تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان)دا کەسایەتیی خۆیان لێ وون دەبێ و بەشێوەیەك خۆیان پێشان دەدەن کە خۆشیان دەزانن ئەو کەسە نین. هەروەها باسم لە هاوڕێیەتیی و خۆشەویستیی و هاوسەرگیریی نێوان ئافرەت و پیاو کردووە. یان زۆر جار بینیومە کەسێك شتێك دەزانێ بەڵام ناتوانێ ئەزموونی بکات، چۆن یەکێك ئیرادەی بەهێز بکات؟ چۆن کەسێك جڵەوی نەفسی سەرکێش بخاتە ژێر ڕکێفییەوە؟ یان چۆن ئیمان بەهێزتر

و، دڵ بۆ گرفتان قایمتر و، عەقڵ و فیکیریش لە دونیادا تیژتر دەبن؟ مەبەستم ئەوەیە، تەوەر و باسەکان ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوە و قۆناغی ڕووحیی و تێگەیشتنی خۆمن، نەك وەك حیکایەتی بەر ئاگردان دانیشتبم، بڵێم با بابەتی جوان و زیرەکانە دابنێم!

کتێبەکە لە (٢٥) تەوەر پێکدێت، هەر تەوەرەی باس و خواسێکی جیاوازە، ڕیزبەندیی تەوەرەکانی کتێبەکەم واداناوە لە سەرەتای ژیانەوە دەستپێبکات بەرە و کۆتایی، بە پلەپلەیی. بۆ وێنە: (تەوەری یەکەم) باس لە بوونی مرۆڤ و حەقیقەتی ژیان دەکات. (تەوەری دووەم) باس لەوە دەکات مرۆڤ لە ژیانیدا بەگشتیی و بە تایبەتیی لە چیدا شارەزایی کۆبکاتەوە؟ (تەوەری بیست و پێنج) کە کۆتا تەوەرە، دەربارەی مردن و کۆتایی ژیانی دونیایە.

ئومێدم وایە هەر کەسێك، لەهەر قۆناغێکی فکیریی و ڕووحیی و کەلتووریی دابێ، ئەگەر کتێبەکە بە باشیی و بەڕووحی وەرگرتن بخوێنێتەوە و هەزم بکات، إن شاء اللە، گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە ژیانیدا دروست ببێ.

لە کۆتاییشدا،

زۆر هەوڵمدا بە جۆرێك لە جۆرەکان سوپاسگوزاریی خۆم بۆ دایك و بابم دەرببڕم، بەڵام ئەوەی دەمنووسی ڕەشمەکردەوە، چونکە هیچ دەربڕینێك لەلام نەگەیشتە شایستەی ئەوان. تەنها دووعا دەکەم خوای پەروەردگار لوتف و بەزەییم لەگەڵ بنوێنێ، وام لێبکا شایستەی ئەوەبم زیاتر هیدایەتم بدات و ببمە جێگای بارسووکیی و سەرفرازیی بۆ دایك و بابم لە دونیا و قیامەتدا. ئەگەر هەر گوناحێکم کرد، خوایە ئەوان باشترین و چاکترینی شتەکانیان فێرکردووم و لە خراپەی خۆمە. ئەگەر چاکەیەکیشم هەبوو، سەرچاوەکەی لەوانەوەیە، خوایە گیان پاداشتەکەی بەر لەوەی بۆخۆم بێ، با بۆ ئەوان بڕوا. ئامین.

**شەریف عەلی باپیر**

# سوپاس و پێزانین

لە ژێر ڕۆشنایی فەرموودەی: {لَا يَشْكُرُ اللهَ مَنْ لَا يَشْكُرُ النَّاسَ}.[١] (ئەوەی بەرانبەر بە خەڵك سوپاسگوزار نەبێ، سوپاسی خوای نەکردووە) بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە بکەم کە یارمەتیدەر بوون لە بە چاپ گەیاندنی کتێبەکە، بە تایبەتیی کاك حاجی حەیدەر موزەففەر. خوای پەروەردگار بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە و منیش چاکەی ئەوانم لەبەرچاوە. بە دەرفەتێکی گونجاوی دەزانم خۆشەویستیی و پێزانینم بۆ هەردوو مامۆستا و برای دڵسۆز و دانام دەرببڕم، کاك حاجی ئیحسان مەلا خالید و کاك عەدنان مەلا خالید. خوای بێ وێنە ساغ و سەلامەت و سەرکەوتوویان بکات.

١) أخرجه أحمد برقم (٧٩٢٦)، وأبو داود برقم (٤٨١١)، وابن حبان برقم (٣٤٠٧)، وأبو نعيم في الحلية (١٦٥/٧)، والبيهقي برقم (١١٨١٢). وأخرجه أيضًا: البخاري في الأدب المفرد برقم (٢١٨)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٩١١٧) .




## حەقیقەتی ئەم ژیانە چییە؟

**شـەریف:** مـرۆڤ تـا بە ڕاستیی و دروستیی لە شتێك حاڵی نەبێ، ناتوانێ مامەڵەیەكی تەندروستی لەگەڵدا بكات. مـرۆڤ بـۆ ئەوەی بـاش بـژی، دەبـێ بـاش لە مانـا و ئامـانجی بـوون و ژیـان تێبگـات. زۆر جـار لادان و هەڵخلیسـكانی خەڵكـی لە ژیانـدا، هۆكـاری تێنەگەیشتنیانە لە حەقیقەت و ئامانجی بوونی ئەم ژیانە. بۆ وێنە: ئەوەی ژیانی دونیا وەك خانوچكە قوڕینەیەكی منداڵان نەبینێ لە ڕووی ماددیەوە، لەبەر خورما ئاگای لە خوا نامێنێ. یان دەبینی یەكێك هیچ هەست بە ئەرك و بەرپرسیاریەتییەكانی ژیان ناكات، یان كەسانێكی تر لەسەر حیسابی لایەنەكانی دیكەی ژیان هەر خەریكی پارەكۆكردنەوە و خۆدەوڵەمەندكردن و چێژوەرگرتنن لە خۆشیە كاتییەكان، خۆیان سەرقاڵی شتە گچكەكانی

ژیـان کـردووە، بێئاگـا لەوە کە هەژارە ڕاسـتەقینەکان ئەو کەسانەن هیچیان نییە پارە نەبێ. بـۆیە پێویسـتە مـرۆڤ بزانێ حەقیقەتی ئەم ژیانە چییە، بۆ هاتۆتە ژیان و دەبێ چیبکـا، ئامـانجی دروستبوونی چییـە و بەرپرسـیاریەتیی چییە لە ژیاندا؟ چونکە کەسێك کە دووربینـە و بەردەوام قیامەت دەبینـێ، قەت ڕەتەڵ نابا و قۆڵـت و لێژییەکـانی ژیــانی دونیــا بە ڕوونیــی دەبینــێ، بەڵام کەســێکی کــورتبین، کە بەس ژیــانی گچــکەڵەی دونیـا دەبینــێ، جـاری وایە بە سـووکە گرفتێـك دونیـای لێـدێتەوە یەك! بەبێ تێگەیشـتنێکی ڕاسـت و دروسـت بـۆ ژیـان، مـرۆڤ ناتوانێ ژیانێکی ڕاست و ڕێك بژی.

بابە گیـان، بۆچوونی جەنابـت چییە دەربـارەی حەقیقەتـی ژیان، ژیان چییە و چۆن مـامەڵەیەکی دروسـتی لەگەڵدا بکرێ؟

بـابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

شەریف گیان!

ئەمشەو بۆت باسی ئەوە دەكەم كە مرۆڤ چۆن دەبێ لەگەڵ ژیانی دونیادا مامەڵە بكات و، چۆن تەماشای ژیانی دونیا بكات. دیارە خوای پەروەردگار لە قورئاندا لە زۆر شوێنان باسی ژیانی دونیا دەكات، دەیشوبهێنێ بە یاری و گەمەی منداڵان، بۆ نموونە لە سوورەتی (الحدید)دا دەفەرمووێ:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحدید.

واتە: [بێگومان ژیانی دونیا یاری و گەمەیە، خۆڕازادنەوە و خۆبەسەربادانە و، پاشان زۆركردنی ماڵ و سامان و كوڕانە، وەك باران (ئاوێك كە لە ئاسمان دێتە خوارێ دوایی سەر زەوی پێی دەڕوێ) و جوتیارەكان پێی سەرسام دەبن بەو كشتوكاڵەی لێی ڕواوە، دوایی گەشە دەكات، دوایی بە زەردهەڵگەڕاویی

دەیبینی، پاشان دەبێتە پووش و پەڵاشێكی تێكشكاو، لە ڕۆژی دواییشدا سزایەكی سەخت هەیە لەگەڵ لێبووردنی خوا و ڕەزامەندیی خوا، ژیانی دونیاش بەس ڕابواردنێكی فریودەرە).

﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ واتە: [ژیانی دونیا تەنیا ڕابواردنێكی فریودەرە]. ئەمە هەمووی لە ڕووە مادییەكەیەوە وایە، دەنا ژیانی دونیا زۆر شتێكی جدییە. خوای پەروەردگار ئەم هەموو پێغەمبەرەی ناردوون (علیهم الصلاة والسلام) لە (موسنەدی ئیمام ئەحمەد)دا هاتووە: ژمارەیان (١٢٤٠٠٠)ە، (٣١٣) ڕەسولن و خوا (١٠٤) كتێبی دابەزاندووە، هەمووی بۆچی؟ بۆ چاككردنی ئەم ژیانی دونیایە، كەواتە: ژیانی دونیا لە ڕووە مادییەكەیەوە ئەگەر تەماشای بكەین، وەكو گەمەی منداڵانە. چۆن منداڵ خانوچكەیەك دروست دەكات، شتێك دروست دەكات، دوایی تێكی دەداتەوە، ژیانی دونیاش یارییە، دێت و دەچێ لە ڕووە مادییەكەیەوە، دەخافڵێ، هەرئەوەندە دەزانێ سەری ئاوا دەبێ و كۆتایی پێ دێ. بەڵام لە ڕووە مەعنەوییەكەیەوە، ژیانی دونیا زۆر گەورە و گرنگە، ژیانی ئەبەدیی لە بەهەشت یان دۆزەخ (خوا پەنامان دات) بەستراوەتەوە بە ژیانی دونیاوە. بۆیەش خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردوون (علیهم الصلاة والسلام) ژیانی دونیا چاك بكەن، ڕێكی بكەن و وای لێبكەن كە بە كەڵكی مرۆڤ بێت

و له مرۆڤ بوەشێتەوە. جا ئێمە پێویستە ئاوا سەیری ژیانی دونیا بکەین، لە ڕووە مادییەکەوە ئەوەندە گرنگیی و بایەخی پێبدەی کە موحتاجی دەستی خەڵك نەبین و چاومان لە دەستی خەڵك نەبێ، دەست لە خەڵك پان نەکەینەوە، بەعیززەتەوە بژین و لوقمەی حەڵاڵ پەیدا بکەین و لوقمەی حەڵاڵیش خوای پەروەردگار ناوی ناوە: فەزڵ و بەخششی خۆی، وەك دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠﴾ الجمعة.

یانی: [ئەی بڕوادارینە! ئەگەر لە ڕۆژی جومعەدا بانگ کران بۆ نوێژ، واز لە کڕین و فرۆشتن بێنن و بەرەو یادی خوا بچن (واتە: تا بانگی جومعەش دەدرێ بۆت هەیە خەریکی کڕین و فرۆشتن و کار و کاسبیی بی) دوایی دەفەرمووێ: هەر کاتێ نوێژ تەواو بوو، بە زەویدا بڵاوببنەوە و داوای بەخششی خوا بکەن، ئەو بژیوە حەڵاڵەی پەیدا دەکرێ ناونراوە: ﴿فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾ بەخششی خوا. ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ زۆریش

یـادی خـوا بـکەن، (لە گەرمەی کـار و کەسـابەتدا) بەڵکـو سەرفرازبن].

چونکە ئەگەر ئینسان یادی خوا بکات لە گەرمەی کار و کاسـبییدا، لە حەڕام و قـۆڵبڕینی خەڵـك و غەش و خیـانەت و خراپە بەدوور دەبێ. کەواتە: ژیانی دونیا دەبێ ئەوەندەی بایەخ پێبدەین کە بیهێنێ، ئاگات لێبێ لە ڕووە مادییەکەیەوە چاوت لە دەسـتی خەڵـك نەبـێ، ئنجـا تەماشـا دەکەیـن هەنـدێ لە فەڕزەکـانی ئیسـلام بە هەبـوونی ئیمکانیـات جێبەجـێ دەبـن، زەکاتدان بە ئینسانی دەوڵەمەند دەکرێ، حەج بە ئینسانی هەبوو دەکـرێ، کـاتی خۆی جیهـاد ئەگەر کەسـێ توانـای نەبـووبێ، چەك و تفاق و ولاخ و شتی تـری نەبووبێ، جەنـگ و جیهـادی بـۆنەکراوە، کەواتە هەنـدێ لە فەڕزەکـان بە ئینسـانی هەبـوو و دەستڕۆیشتوو دەکـرێن، یـانی: نەداریـی و نەبـوونیی خۆشویسـتراو نـین، پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمـووێ: {اللَّهُـمَّ إِنِّـى أَعُوذُ بِـكَ مِـنَ الْكُفْـرِ وَالْفَقْـرِ وَعَـذَابِ الْقَـبْرِ}[1]. واتە: [ئەی خوایە پەنـات پێدەگرم لە بێبڕوایـی و هەژاریـی و سزای گـۆڕ]. یـانی هەژاریـی و نەداریـی بەڵایە و دەبـێ پەنـای لـێ بەخـوا بگـرین، ئەوەش کە بە نـاوی پێغەمـبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گـوتراوە:

١) أخرجـه النسـائي: رقـم (٥٤٨٥)، والحـاكم بـرقم (١٩٥٠) وقـال: صـحيح الإسناد. وأخرجه أيضًا: ابن حبان برقم (١٠٢٦).

"هەژاریی شانازیی منە" ڕاست نییە، بەڵام بە تەئکید گوریس لەبن دونیا ڕاخستن و کردنیە ئامانج و، زیاد لەوەی کە دەیهێنێ گرنگی پێبدرێ، تێپەڕاندنە، ئەوەی دیکەش، کە پشت لە دونیا بکەی و، چاوت لە دەستی خەڵکی بێ ئەوەش کەمتەرخەمییە، (ئەبو حامدی غەززالیی) نموونەیەکی جوان دێنێتەوە، دەڵێ "ژیانی دونیا وەك گۆچان وایە، گۆچان ئەگەر بەدەستتەوە نەبێ، زۆر شت بەوی جێبەجێ دەبن، بەڵام ئەگەر لە باوەشی بگری، بە کەڵك نایەت، دەبێ بەدەستتەوەبێ و لە خۆتی بەدوور بگری و بەکاری بێنی". لە نموونەیەکی دیکەدا دەڵێ "ژیانی دونیا وەك ئاگر، یاخود وەك سۆبە وایە، ئەگەر لێی دووربی سەرمات دەبێ و ئەگەر لێی نزیك بی، دەتسووتێنێ، دەبێ لێی نزیك کەوی بەڵام بایی ئەوەندە نا کە بسووتێی، ئەوەندەش دوورنا کە لێی بەهرەمەند نەبی".

من بۆخۆم لە ژیانی دونیادا هەوڵمداوە لە ڕێی شەرعیی و حەلاڵەوە شتێکم بەدەستەوە هەبێ، کە پێداویستییەکانی خۆمی پێ جێبەجێ بکەم، بەڵام هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە خۆم دەوڵەمەند بکەم و پارە وەسەریەکنان و ئەو شتانە، گرنگە ئینسان چاوی لەدەستی کەس نەبێ، نەك چاوت لەدەستی کەس نەبێ، بەڵکو ئەگەر دەستێکیش ڕووی لێنای، بتوانی هاوکاریی بکەی و دەستگیرۆیی بکەی، چونکە خوای پەروەردگار لە

قورئـانی بەپیـزدا زۆر باسـی ئەو کەسـانە دەکـات کە مـاڵ و سـامانی خۆیـان دەبەخشـن ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: [ببەخشـن لەڕێـی خـوادا]. دەسـتگرتنی خەڵـك، هاوکـاریی خەڵـك یەکێکە لەسیفەتە زۆر پەسندەکان، دەبێ ئینسـان وەك گـوتم لە مـامەڵەی لەگەڵ ژیـانی دونیـادا، ئاگـای لەتێپەڕانـدن و بەزایەدان بـێ، تێپەڕاندن ئەوەیە کە ژیانی دونیا بکەی بە ئامـانج و گوریسـی لەبـن ڕابـخەی، وەك ئەو خەڵـکە کە دەیبینـی، ئەو خەڵـکە دونیـاییە، کەمتەرخەمیـش ئەوەیە کە تـۆ ژیـانی دونیـا پشـت گوێ بـخەی لە ڕووە مـادییەکەیەوە و گـوێی پێنەدەی و پەکت بکەوێ و چاوت لە دەستی خەڵك بێ، هەڵوێستی هاوسـەنگ ئەوەیە کە ژیـانی دونیـا بەئەنـدازەی ئەوەی کە دەیهێنێ ئاگـات لێی بێ، بەڵام نەیکەی بەئامـانج، ئامانجت ئەوەبێ کە خوای پەروەردگـار لێـت ڕازی بێـت، بەڵکـو ئەو ژیـانی دونیـایەش کە هەتە بـیکەی بە ئامرازێـك بـۆ ڕازیکردنـی خـوای پەروەردگـار، وەك قەومی قـاڕوون، کە قـاڕوون بۆخۆی لەبەنـی ئیسـڕائیل بـوو لێیان هەڵگەڕایەوە:

﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡ﴾ القصص: ٧٦

واتە: [لێیان یاخیی بوو کە شەریکەدزبوو لەگەڵ فیرعەون].

قەومی قاڕوون واتە بەنووئیسرائیل پێی دەڵێن: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ﴾ القصص: ٧٧.

واتە: [ئەوەی خـوا پێیـداوی، بـیکە بە ئـامڕاز بـۆ بەدەسـت هێنانی ژیانی ڕۆژی دوایی (مەنزڵگای کۆتایی)].

ژیانی دونیا خۆی ئامانج نییە و ئامڕاز و وەسیلەیە، ئنجا ئا ئەوە هەڵوێستی ڕاست و دروستە، لە بەرانبەر ژیانی دونیادا، خوا یارمەتیمان بدات لە هەموو شتێکدا میانڕەو بین، تێنەپەڕێنین و کورت نەهێنین، نە لە شەرع بەولاوەتر بچین، نەبەجێ بمێنین، ئەوەی کە خـوا فەرمـوویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا﴾ البقرة: ١٤٣.

واتە: [ئێوەمان گێڕاوە بە کۆمەڵێکی میانڕەو] هاوسەنگیی و خەتـی نێوەڕاسـتگرتن لە هەمـوو شـتێکدا، ئامـانج بە ئینسـان دەپێکێ.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم




## لە چیدا خۆم شارەزا بکەم؟

شـەریف: هەر لە سـەردەمی ئـادەم و حەواوە (سـەلامی خوایـان لێبـێ) خـوای پەروەردگـار ئەمـری فەرمـووە بە فێربـوون و تێرامـان و خۆشـارەزاکردن. چـونکە بەبـێ شـارەزایی و زانیـاریی، مـرۆڤ لە دونیـای مەعنەوییـدا کـوێرە. وەك گوتراوە: جیاوازیی نییە لە نێوان کەسێك کە خوێندەواریی هەیە و نـاخوێنێتەوە، هەروەهـا کەسـێك کە خوێنـدەواریی نییە. زانـین و شـارەزایی دوو بەرپرسـیارییەتیی قورسـن و زۆرجار زانینی ڕاستییەکان، ڕێگر دەبێ لەوەی مـرۆڤ چێـژ لە خۆشـییە سـواقدراوەکانی ژیـان ببینـێ، ڕەنـگە زۆربەی خەڵکـی وایـان پێخـۆش بـێ خۆیـان لە حەقیقەتەکـانی ژیـان بێئاگـا بـکەن، تـا بتـوانن کەمە چێژێـك لە شـتەکان وەربگـرن بەڵام لە ڕاسـتییدا چێـژ و تـامی ڕاستەقینە لە زانـین و شـارەزابووندایە. شـارەزابوون

چەنـــدە گـــرنگە، لەچیـــدا خۆشـــارەزاكردن، دوو هێنـــدە گرنگترە، لەسەر ئەم باسە پرسیارم لە بابم كرد:

بابە گیان! زۆر جار ملی ڕێگـایەك دەگرم، دەست دەدەمە باسـێك، بەڵام لەخـۆم دەپرسـم: ئایـا پێویسـت دەكـات لەو باسـەدا شـارەزابم و كـاتی بـۆ تەرخـان بـكەم؟ ئەوەی دەمەوێ لێت بپرسم، پێت باشـە لە چیـدا بەگشـتیی و لە كام شتەدا بە تایبەتیی خۆم شارەزا بكەم؟

بـابــم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

كاك شەریف گیان!

ئەمشـــەو ١٧ی ڕەمەزانـــی ١٤٤١ی كـــۆچییە، بەرامـــبەر ١٠.٩.٢٠٢٠ من لە هەولێرەوە قسەت لەگەڵدا دەكەم.

لەو بـارەوە كە ئایـا واباشـە مـرۆڤ لە چیـدا بە تـایبەت زۆر شـارەزابێت و، بەگشـتیی لە چیـدا خـۆی ڕۆشـنبیر بكـات و شارەزابكات؟

زانایـان لە پێناسـەی مرۆڤـی ڕۆشـنبیردا (مثقف) گوتوویـانە ئەو كەسـەیە كە لە هەر شـتێكدا شـتێك بزانێـت و، لە شـتێكیش

هەموو شتێك بزانێ. چونكە ناگونجێ مرۆڤ لە هەموو شتێك زۆر بزانێ، بەڵام دەگونجێ لە هەر شتێك، شتێك بزانێ.

ئەگەر تەماشای مێژووی زانایانی خۆمان بكەین، تەماشای ژیاننامەكانیان بكەین، زانایانی پێشێ (مەوسووعیی) بوون، واتا زانیاری فراوانیان هەبووە لە بارەی كۆمەڵێ شت، هەڵبەتە ئێستا زانست زۆر لقی لێ بۆتەوە، مرۆڤ وەك جاران ناگونجێ لە هەموو شتێكدا بگاتە ئەوپەڕی، وەختێ خۆی زانایان توانیویانە زۆر بە وردەكاریی ئەو زانستانەی كە لە سەردەمی ئەواندا باوبوون، بە وردەكارییەكانیاندا بچنە خوارێ، بەڵام ئێستا زانست زۆر فراوان بووە، هەر زانستێك كە كاتی خۆی یەك زانیاریی بووە، دە لقی لێ بۆتەوە، هەر لقەش دە لقی لێ بوونەوە. ڕۆژ بە ڕۆژیش زانیاری مرۆڤ پەرش و بڵاو دەبێت، دەچێتەوە نێو وردەكارییانەوە. دكتۆری ئێستا پێیان گوتووە: حەكیم، ئەوەنیە دەڵێن، "سەد حەكیم بە قەت دەردەدارێك نازانن".

ئەو كات یەك كەس شارەزابووە لە هەموو شتێكدا، بەشێكی لێ زانیوە، بۆ نموونە: (ابن سینا) كتێبێكی هەیە بەناوی (القانون فی الطب) كە لە ئەورووپا ئەو كتێبە وەرگێڕدراوە، زۆر كەس سوودیان لێ بینیوە. بەڵام ئێستا تەماشا دەكەین زانستی پزیشكییگەریی، زانستی ئێسقان جیایە، زانستی فەقەڕات

جیایە، بڕگەکانی پشت جیایە، هی بڕگەکانی مل جیایە، چاو، گوێ، هەتا کۆتایی. ئەوە لە ڕووی زانستیی پزیشکییەوە، هەروەرها لە ڕووی ڕووەك ناسییەوە، لە ڕووی زەوی ناسییەوە، لە ڕووی گەردوون ناسییەوە، بۆ وێنە: فیزیا هەیە، کیمیا هەیە...هتد.

ئنجا من ئامۆژگاریت دەکەم کوڕی خۆم!

لەم ڕۆژگارەدا واباشە لە هەر کامێکیان سەرە دەرێك بکەی، بەلایەنی کەم کە گوتیان: (فیزیا) بزانی چییە، ئەگەر گوتیان: زانایاریی جەبر، گەردوون ناسیی، شتێکی لێ بزانی. ئەگەر گوتیان: زەوی ناسیی، مێژوو، جوگرافیا، مێژووی دەسەڵاتی ئیسلامیی، مێژووی مسوڵمانان، مێژووی ڕۆژئاوا، مێژووی یابان، چین، ئەورووپا، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، هەر شتە شتێکی لێ بزانی.

لە یادمە جارێك یەکێك لە کوڕەکان، یان دوو سێیەکتان بوون، گوتتان: بابە! فڵان مامۆستا وتاری دەدا دەیگوت شاری یابان فڵان شتەی هەیە. گوتتان: ئەو مامۆستایە هیچ شارەزای جوگرافیایی نییە، وادەزانێت یابان هەمووی شارێکە، نازانێت چەندین شاری گەورەی تێدایە! جا مرۆڤ دەبێت لە جوگرافیا شتێکی لێ بزانێت، لە بواری ناسینی گۆی زەوییەوە، ئەم دونیایە چەند کیشوەر و قاڕەیە، هەروەها لە بارەی ئەم

گەردوونەوە کە تێیدا دەژین، مرۆڤ سەرە دەرێکی لێبکات. هەروەها لە مێژوو شتێکی لێ بزانێت، فیزیا شتێکی لێ بزانێت، لە بارەی زانستی پزیشکییەوە شتێکی لێ بزانێت. لە بارەی زانستی لۆژیك و مەنتیق و، شێوەی قسەکردنەوە، شتێکی لێ بزانێ، ئەوە وەك زانستەکان بە گشتیی.

ئەمما من پێم چاکە ئەگەر تۆ داوام لێ دەکەی لە چیدا خۆم شارەزا بکەم؟ هەوبڵدە لە قورئاندا زۆر شارەزابیت، کوڕی خۆم. چونکە (کتاب الله) هەموو شتێکی تێدایە، ئەگەر مرۆڤ شارەزای قورئان بێت، قورئان بناغەی دینداریی مسوڵمانانە و فەرمایشتی خوایە، لە ڕاستییدا کۆکەرەوەی ئایین و بەرنامەی خوایە، هەر بۆیە من ئەو کتێبەی لە زینداندا نووسیومە: (الاسلام کما یتجلی فی کتاب الله) واتە: (ئیسلام وەك لە کتێبی خوادا دەدرەوشێتەوە). کە لە چاپی دووەمیدا لە دوازدە (١٢) کتێبدا چاپکراوە، هەمووی لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا. کتێبی یەکەمم تەرخانکردووە بۆ بووناسیی، گەردوون چییە؟ خوا کێیە؟ ژیانی دونیا چییە؟ مرۆڤ چییە و بۆچی دروست بووە. هەروەها یازدە (١١) کتێبەکەی دیکەش بۆ خستنەڕووی ئیسلام بە گشتیی و بە هەموو بوارەکانییەوە.

بەڵام ئامۆژگارییت دەکەم: قورئان خوێندنەوە و چۆنیەتیی خوێندنی، چەندە گرنگە، چەند ئەوەندە گرنگە لە قورئان

تێــبگەی، چــونکە ئێســتا هەنــدێك لەوانەی بە چــۆنیەتیی خوێندنەوەی قورئاندا قووڵبوونەوە، تووشی تێپەڕاندن بوون لەسەر حیسابی لێتێگەیشتنی و کارپێکردنی! هەر زانیارییەك تۆ بتەوێت بگەیە ئەوپەڕی، ئەگەر هەموو تەمەنی خۆتی لێ سەرف بکەی، ناگەیە ئەو سەری. وەك گوتم، کاتی خۆی زانستەکان سادەبوون، بەڵام ئێستا لق و پۆپیان لێ بۆتەوە، ئێستا زانستی (تجوید) بتەوێ بگەیە ئەوپەڕی، هەموو تەمەنی خۆتی لێ سەرف بکەی، ئێستا ناگەیە ئەوپەڕی. زانستی ڕێزمانییش هەروایەو زانستی ڕەوانبێژیی و...هتد. هەمووی هەر وایە.

ئنجا لە ڕاستییدا، هەروەك خوێندنەوەی قورئان بۆ ئەوەیە چاك قورئان بخوێنیەوە، چاك خوێندنەوەی قورئانیش بۆ چاك لێتێگەیشتنیەتی، چاك لێتێگەیشتنیش بۆ چاك کارپێکردنیەتی. ئینجا دەبێت مرۆڤ وریا بێت و هاوسەنگیی ڕابگرێت لە نێوان زانستەکاندا، ئەو زانیارییانەی کە زانیاریی ئالییان پێ دەڵێن و ئامرازن. بایی ئەوە خۆیان پێوە ماندووبکات، بایەخیان پێبدات، کە وەك ئامرازێك بەکاریان بێنێ.

دکتۆر موستەفا زەڵمیی (بەڕەحمەت بێ) شتێکی خۆشی بۆ گێڕامەوە، گوتی:

"جارێك کە لە سەرسیان لە گوندی سەرسیان مەلا بووم، حاجی ڕەسووڵ ئاغا هەبوو، پیاوێکی زۆر شارەزا بوو، نیمچە مەلا بوو، هەرکات دەهاتە (حوجرە) گوێی دەگرت کە من دەرسم بە فەقێکان دەگوت. ڕۆژێك گوتی: کاکە مەلا! ئەو عیلمەی تۆ فێری ئەو فەقێیانەی دەکەی دەزانی وەك چیم دێتە پێش چاو؟ گوتم: ناوەڵا. گوتی: وەك ئەوە وایە کەسێك هەر بیەوێت خۆی فێری تفەنگ چییەتیی بکات، بەڵام دوایی نەچێتە ڕاوێ، بە تفەنگەکەی هیچ نەکات. تۆ ئێستا ئەو عیلمەت فێرکردن بەڵام ناچن پێی لە قورئان و حەدیس تێبگەن!".

گوتی قسەکەی زۆر جوان بوو.

جا مرۆڤ دەبێ وریابێ، ئەو زانیارییانەی فێریان دەبێ، پێویستە خزمەتی قورئان و سوننەتیان پێ بکات. خولاسەی قسەکەم ئەوەیە، هەولبدە لە هەر شتە، شتێك بزانی، بەڵام وانەبێ بە باریکە ڕێیەکدا بڕۆی و هەموو توانای خۆتی تێدا سەرف بکەی، ئێستا مامۆستای زانکۆ هەیە، لە پسپۆڕییەکەی خۆیدا زۆر شارەزایە، بەڵام سەبارەت بە هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆمەڵگا،

لەگەڵ خزمـــان، لەگەڵ دراوســـێ، لە بەرومەجلیســـدا، لەوانەیە هیچی لێ نەزانێ! گرنگە مرۆڤ ڕۆشنبیر بێ و فیکری فراوان بێ و لە شتێکیشدا زۆر بزانێ، ئەو شتەش بریتییە لە قورئان و سوننەت.

ئەمە ئامۆژگاریی ئەمشەوم بوو، خوا پشتیوان بێ سوودت لێ بینیوە.

والسلام عليكم ورحمة الله




## بۆچی خواپەرستیی گرنگە؟

شەریف: خوای پەروەردگار پەرستنی خۆی لەسەر فەرز کردووین، چونکە بۆ خۆمان باشە، دەنا خوای پەروەردگار بێ نیازە لە هەموو کەسێك و شتێك. بەڵام خواپەرستیی بۆچی پێویستە، یان بۆچی باشە؟ مرۆڤ بەر لەوەی پێکهاتەیەکی جەستەیی و ماددیی بێ، تێکەڵەیەکی ڕووحیی و مەعنەوییە، لایەنی ڕووحیی و مەعنەوییش تەنیا بە نزیکبوونەوە لە خوای باڵادەست، گەشە دەکات. هەموو مرۆڤێکی بڕوادار و بێبڕوا دەزانێ ئەم ژیانە گەشتێکی کاتییە، تاکو خوای پەروەردگار نەکرێتە خولگە و چەقی ئامانج، مرۆڤ نازانێ بۆچی چاکە بکات یان بۆ خۆی لە خراپە بەدوور بگرێ؟ چونکە هیچ پاڵنەر و هێزێك نابێ ڕێی بۆ ڕۆشن بکات و کەمەندکێشی بکات. ئەوانەی لە خواپەرستیی دوورن لایەنی ڕووحییان سیس و لاواز دەبێ، تووشی چەندان

نەخۆشیی دەروونیی دەبن، وەك خەمۆكیی و بێتاقەتیی و بێهیوابوون و ئاڵوودەبوون بە شتە پیسەكان و هەروەها. بەبێ خواپەرستیی مرۆڤ نزم دەبێتەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ و ژیانداران، تەنیا دەخوات و دەخەوێ، بگرە لەوانیش نزمتر دەبێ. خولاسەی قسان، ڕووح، مرۆڤ لە بونەوەرەكانی تر جیا دەكاتەوە، ڕووحیش كە دروستكراوێكی خواییە تەنیا بە خواپەرستیی و نزیكبوونەوە لە خوا گەشە دەكات.

بابە گیان! خواپەرستیی چییە و گرنگیی و بەرهەمی خواپەرستیی چییە، لە ژیانی مرۆڤدا؟

بـابــم:

زۆر باشه،

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمد لله، وصلى الله تبارك وسلم على رسول الله محمد واله وصحبه المهتدين بهداه.

كاك شەریف!

ئەمشــەو بـۆت باســی خواپەرســتیی (العبــادة) دەكەم. خــوا (سبحانه وتعالى) له سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرمووێ:

(وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾) الذاريات

واته: [جنــد و مــرۆڤم تەنیــا بــۆ ئەوه دروســتكردوون كه بمپەرستن (واته بەندایەتییم بۆ بكەن)].

ئینجا پێشێ با بزانین عیبادەت و خواپەرستیی یانی چی؟

عیبــادەت له (عَبَــدَ، یَعبُــد، عِبــادةً) هــاتووه. واته: پەرستی، دەپەرستێ، پەرستن.

(پەرستن) یانی چی؟

یـانی ئەوپەڕی ملکەچیـی نوانـدن و، ئەوپەڕی بە گەورە و بەرزگرتن و، ئەوپەڕی خۆشویستن و، سام و هەیـبەت لـێ کـردن و، پشت پێ بەستن، بۆ خوا.

زانایان دەڵێن: دەبێ ئەم پێنج شتە پێکەوە کۆببنەوە ئنجا بە عیبـادەت لە قەڵەم دەدرێـن: ١. ئەوپەڕی مـل بۆ کەچکـردن ٢. لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشویستن ٣. لەگەڵ ئەوپەڕی سام و هەیبەت بەرامبەر هەبوون ٤. لەگەڵ ئەوپەڕی بەگەورەگرتن ٥. لەگەڵ ئەوپەڕی پشت پێ بەستن. ئەگەر ئەمـانەت هەبـوو بـۆ خوا، ئەوجـار مانـای ئەوەیە تـۆ خوای پەروەردگـارت پەرستووە. بەڵام ئەگەر هەرکـام لەوانەت بـۆ غەیـری خـوا بێـت، ئەوا ئەو غەیـرەت پەرسـتووە، ئینجـا عیبـادەت ڕاسـتەوخۆ لە ئیمـانەوە هەڵـدەقوڵێ، هەر کەسێك بـڕوادار بێت بە خـوا، خـوا پەرستیش دەبێـت، بە ئەنـدازەی ئەوە کە ئیمـانەکەی دامەزراو و مەحـکەم دەبێت، ئیمانەکەش چاك دەبێت. هەروەك چۆن ئەگەر درەختێك بەڕاسـتیی درەختـی بەردار بێـت، دەبـێ بەر و میـوە دەربکـات، هەروەهـا کـانییەك ئـاوی تێـدابێت، ئـاوەکەی لـێ هەڵـدەقوڵێ و جـۆگەلەی لـێ هەڵدەسـتێ، عیبـادەتیش ئـاوێکی سـازگارە لە کانیـاوی ئیمـانەوە هەڵـدەقوڵێ، ئنجـا یەکێـك دەپرسـێ: خـوا

(سبحانه وتعالى) بۆچی بەندایەتییکردن بۆخۆی، لەسەر مرۆڤەکان پێویست کردووە؟

خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێ:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: [هەر کەسێك چاکە بکات سوودەکەی بۆ خۆیەتی، هەروەها هەر کەسێك خراپە بکات زیانەکەی بۆ خۆیەتی، دواییش بۆلای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە].

کەواتە: خوا بۆیە بەندایەتییکردنی بۆخۆی، لەسەر مرۆڤەکان پێویست کردووە، چونکە مرۆڤەکان پێویستیان بەوە هەیە، ئەگەرنا بەتەئکید خوا لە دروستکراوەکانی بێ نیازە. بەدڵنیایییەوە خوا بێ نیاز و بێ ئیحتیاجە لە هەموو جیهانییان، وەك لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرمووێ:

﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ ﴾ فاطر.

واتە: [ئەی خەڵکینە ئێوە هەژار و ئاتاجن بۆ لای خوا و، خوا بێ نیازە لە هەموو جیهانییان، خوا بەس خۆی بێ نیازی

ستاییشکراوە، ئەگەر بیەوێ ئێوە لادەباو دروستکراوانێکی دیکە دێنێ و، ئەوەش لەسەر خوا قورس و زەحمەت نییە].

کەواتە! کوڕی خۆم! گرنگە ئێمە ئەوە بزانین کە خوای پەروەردگار بۆیە پەرستنی خۆی لەسەر ئێمە پێویستکردووە چونکە خۆمان پێویستیمان بەوە هەیە، پێویستییەکە چییە؟ پێویستییەکە ئەوەیە:

**یەکەم:** خوا شایستەی پەرسترانە و، بۆ ئەوەی ئێمە سپڵە و بێ وەفا نەبین.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی ئەگەر ئێمە خوا نەپەرستین، مرۆڤ ناتوانێ بەبێ پەرستراو بێت و، شتێکی دیکە دەپەرستین. ئەوەی خوا نەپەرستێ، شەیتان دەپەرستێ، هەوا و ئارەزوو دەپەرستێ، ڕژێمێکی کافر، حیزبێکی کافر، تاغوتێك، بەلایەنی کەمەوە ئەفسانەیەك، هەواو ئارەزووێك دەپەرستێت. هیچ گومانی تێدا نییە ئینسان بەبێ پەرستراو نابێت، یان دەبێ خوا بپەرستێ کە پەرستراوی ڕاستەقینە و پەرستراوی شایستە تەنیا خوایە، یان دەبێ جگە لە خوا بپەرستێ، ئینجا دار و بەردە، مرۆڤە، حیزبە، شتێکی مەعنەوییە، شتێکی مادديیە، شتێکی ئەفسانەییە، یان شتێکە بوونێکی ڕاستەقینەی هەبێت. گرنگ ئەوەیە شتێك هەر دەپەرستێت.

**سێیەم:** بەهۆی بەندایەتییکرندەوە بۆ خوا، ئێمە کۆمەڵێك سیفەتی پەسند و بەرز و خەسڵەتی چاکمان تێدا پەیدا دەبن، وەك ئازایەتیی، ئازادیی، ویژدان، سەبر و خۆڕاگریی، پشوودرێژیی، بەرچاوڕوونیی لە دونیادا، پشت بەخوابەستن و پشت قایم بوون بە خوا، ڕاوەستاویی و دامەزراویی. کۆمەڵێك سیفەتی بەرز (فضائل) لە ئێمەدا پەیدا دەبن بەهۆی بەندایەتییکردن بۆ خوا و بەهۆی پەرستنی خواوە، ئینسان ئەگەر خوا نەپەرستێ، لە جێی ئەو سیفەتە بەرزانە سیفەتی نزم پەیدا دەکات، وەك ترسنۆکیی، ڕەزیلیی و چرووکیی، لەرزۆکیی و بێسەبریی، بەرچاو لێڵیی. ئنجا پەرستنی خوای پەروەردگاریش کۆمەڵێك درووشمی هەن کە هەر کەسێك ئەو درووشمانەی تێدابوون، دەزانی کە ئەو کەسە خواپەرستە، وەك شایەتمان، شادە هێنان بە وەحدانیەتیی خوا کە تەنها خوا پەرستراوە و (محمد) (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕەوانەکراوی خوایە، ئینجا پێنج نوێژە فەرزەکان (بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر، شێوان، خەوتنان)، پاشان ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، ئنجا زەکاتدان و، حەج و، عەمرە و زیکری خواکردن. بەڵام ئەوانە تەنیا دروشمەکانی خواپەرستیین، ئەگەرنا خواپەرستیی

چەمــکەکەی زۆر فــراوانە و هەمــوو کایەکــانی ژیــان دەگــرێتەوە و، لە حەقیقەتــدا دەبــێ هەمــوو خانەکــانی مـرۆڤ مـۆری خواپەرستییان پێوە بندرێ و، لە هەمـوو کایەکانی ژیانـدا مـرۆڤ خواپەرست بێت، نەك تەنیـا لە مزگەوتـدا خـوا پەرسـت بێـت و، لە بـازاڕ و لە دائیـرە و لەملاولا شتێکی دیکە بپەرستێ! دەبێ خۆشەویستترین و گەورەتـرین و بەرزتـرین و مـل بـۆکەچکراوترین کەس و، پشت پێ بەستراوترین لە ژیانیدا، تەنیا خوا بێت.

ئەوە قسەی ئەمشەومان بوو لەبارەی خواپەرستیی: گرنگیی و بەرهەمەکەی، خــوا بە لوتــف و کەرەمــی خــۆی ئــێمە لەو کەســانە بگێــڕێ، کە هەم درووشــمەکانی خــوا پەرســتیی لە خۆماندا بێنینەدی، هەم بە واتای گشتیی خواپەرستیی، بۆ خـوا پەرستەر (عابد) بین.

وصلى الله على محمد و على اله اجمعين




## زیکر و یادی خوا

شەریف: لەم سەردەمەدا زۆر کار لەسەر ئەوە دەکرێ ڕووح و ویژدان، خواپەرستیی و یادی خوا، دابڕن لە تاك و کۆمەڵگا، خەڵکی سەرقاڵبن بە گەدە و ژێرگەدەیان، نەپرژێنە سەر بابەتی ڕووحیی و فیکریی، چونکە دەسەڵات و حکومڕانەکان خەڵکی وریا و زیندوویان ناوێ، ئەوان ڕاوچی خراپن و تەنیا لە ئاوی لێڵدا ڕاویان بۆ دەکرێ. بەڵام وەك چۆن جەستەی مرۆڤ بەبێ وەرزش پێکردن و خواردنی تەندروست و خەوی پێویست، دەپووکێتەوە و لاواز دەبێ و تووشی نەخۆشیی دەبێ، ڕووح و لایەنی مەعنەوییش لەخۆوە گەشە ناکات و بەهێز نابێ ئەگەر کاری لەسەر نەکرێ. هەروەها زۆرێك لەو نەخۆشییە جەستەییانەی تووشمان دەبن، بەهۆی لاوازیی لایەنی مەعنەویی و ڕووحییەوەیە، بۆ وێنە: دەبینی یەکێك تووشی خەمۆکیی و بەدخۆراکیی دەبێ، چونکە

بڵاوکراوەکانی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بینەری کەمیان هەیە، کەسێکی خواپەرستیش بەڵایەکی زۆر گەورەی بەسەردێ و دەڵێ: خوایە ناشوکر نابم و دەزانم بە تاقیکردنەوە بەسەرتکردوومەوە. زیکر و یادی خوا داینەمۆی کارکردن و ووزەی ڕووح و خواپەرستین و، باشترین خواپەرستیش مرۆڤی مسوڵمان بیکات، زیکرکردنە. بۆیە پرسیارم لە بابم کرد مانای (ذکر) چییە، چۆن دەکرێ، کاریگەرییەکانی چین؟

بابم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف!

ئەمشەو بە کورتیی بۆت باسی (ذکر) دەکەم:

چەمك و واتایەکەی چییە؟

چۆنیەتەکەی چۆنە؟

کاریگەرییەکانی چین؟

**١:** بەنسبەت چەمك و واتای (ذكر): وشەیەكی عەرەبییە و ڕاغیبی ئەصفەهانیی بەم شێوەیە پێناسەی كردووە "بریتییە لە هێنانەوە بیر خۆی شتێك كە لە بیرت بووە بەڵام لە بیرت چووەتەوە (نَسِیتُ الشيء الفلاني فذكرتُه) واتە: فڵانە شتم لە بیرچوو دواتر بەبیرم هاتەوە". ئەمە واتایەكی زیكر، واتە: هاتنەوە بیر، هاتنەوە یاد.

واتای دووەمی (ذكر) ئەوەیە: تۆ شتێك باس بكەی و بەسەر زمانتی دابێنی، واتە؛ مەرج نییە دوای لەبیرچوونەوە بێت بەڵكو شتێكە كە باسی دەكەی (ذكر فلان فلانا بخیر) واتە فڵانكەس فڵانكەسی بە خێر باس كرد (وەسفی بە چاكە كرد).

(ذكر) ئەم دوو واتایەی هەن: هێنانەوەی شتێك كە بیرت چووەتەوە یان لێی بێئاگابووی و دەیهێنیتەوە بیری خۆت، كە ئەمە یادكردنەوەی پێ دەڵێن، یان كە شتێك باس دەكەی.

ئنجا بەهەردوو واتایەكە زیكری خوا ئەوەیە كە تۆ خوای بێ وێنە بهێنیتەوە یادی خۆت، هەروەها كە ناو و سیفەتەكانی خوا باس بكەی. یانی كە ئێمە دەڵێین: (لا اله لله الا لله)، (الحمدلله)، (استغفرلله)، (سبحان الله)، (الله اكبر) ... ئەمانە

هەموویان بریتیین لە باس کردنی ناو و سیفەتەکانی خوا. ئەمە چەمك و واتای زیکر.

**٢:** شێوازی زیکر و میکانیزمەکەی، دەگونجێ مرۆڤ تەنها لە دڵی خۆیدا بێت، بەبێ بەسەر زماندا هێنانی، وەك خوای بەرز و مەزن دەفەرمووێ:

﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾ الأعراف.

واتە: (یادی خوا بکە لە دڵی خۆتدا، بە کڕووزانەوە و بە ترس و لەرزەوە و، بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە بەیانیان و ئێواران و، لە بێئاگایان مەبە!).

ئەوە شێوازی یەکەمە، ناوی پەروەردگار لە دڵ و دەروونی خۆتدا بێنی.

شێوازی دووەم: ئەوەیە وێڕای بەدڵدا هێنان، بەسەر زمانیشتدا بیهێنی، ئەمەش وەك لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و پێش نانخواردن و دوای نانخواردن و کاتی چوونەماڵ و خەوتن و لەخەو هەڵسان و... ئەمانە هەموویان وێڕای ئەوەی کە بە دڵن، بەسەر زمانی خۆشتیاندا بهێنی، ئەوەش شێوازێکی دیکەی زیکر.

شێوازێکی دیکەی زیکر ئەوەیە کە بە تەنها یادی خوا بکەی، یان دەکرێ بەدەستە جەمعیی بێت، کە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) هەندێك جار بە کۆمەڵ یادی خوایان کردووە و لە حەدیسی سەحیحدا هاتووە و هەندێك جاریش بە تاك.

شێوازێکی دیکەی زیکر و لە ڕوویەکی دیکەوە: دەگونجێ زیکر هەم بەدەنگی بەرز بێ، هەم بەدەنگی نزم، بە ئاشکرابێ، یان بە پەنهانیی بێ، ئەمەش شێوازەکانی زیکر.

**٣:** گرنگیی و بەرهەمی زیکر لە ژیانی مرۆڤدا، خوای میهرەبان زۆر بەڕوونیی دەفەرمووێ:

﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد.

واتە: [ئاگاداربن! بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن].

لەڕاستییدا، زیکر وەك چۆن ڕووەکێك کە تیشکی خۆر لێی دەدات و پرۆسەی ڕۆشنەپێکهاتن ئەنجامدەدات، یاخود ئاو دەدرێت، خۆراك بە ڕەگەکانی لە زەوی وەردەگرێت، یان تیشکی خۆر بە هۆی گەڵاکانیەوە وەردەگرێت، ڕووەك هەم بە وەرگرتنی تیشکی خۆر کە لە ئەنجامی تیشکەکەدا خۆراك دروست دەکات و دەینێرێت بۆ ڕەگ و بەشەکانی دیکەی، ڕەگیش ئەو

خۆراکەی لە زەوی وەریگرتووە دەینێرێ بۆ سەرەوە واتە: قەد و پۆپ و گەڵا، کەواتە: ڕووەك هەم بە ڕەگ و هەم بە گەڵاکانی خۆراك وەردەگرێت. ئنجا وەك چۆن ڕووەك و درەخت لە ئەنجامی ئەو خۆراکەی کە وەریدەگرن، گەشە دەکەن و جوان دەبن و بەرهەمیان دەبێ، مرۆڤیش لە ئەنجامی ئەو یادەی پەروەردگاریدا دڵی ئاوەدان دەبێت.

بۆیە لە حەدیسی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) هاتووە:

{ مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ }.[1]
واتە: [ئەوەی یادی خوا دەکات و ئەوەی یادی خوا ناکات، وەك مردوو و زیندوو وان].

## جۆرەکانی زیکر:

زیکر جۆری زۆر زۆرن. بەڵام گەورەترین جۆری زیکر، بریتییە لە قورئان خوێندن و یەکێك لە ناوەکانی قورئان بریتییە لە زیکر:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر.

خوای پەروەردگار چوار ناوی بۆ قورئان داناوە. یەکیان: (قرآن) (خوێندراوە). دووەم: (کتاب) (نووسراو). سێیەم (ذكر)

---

١) أخرجه البخاري برقم: (٦٠٤٤).

(یادکردن)، چوارەمیش (فرقان) (جیاکەرەوە). لە قورئاندا ئەم چوار ناوە بۆ قورئان بەکارهاتوون.

کەواتە: قورئان گەورەترین جۆری زیکر و یادی خوایە، هەروەها لە حەدیسی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دا هاتووە:

{أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ}[1] واتە: [لا اله الا لله گەورەترین زیکرە].

هەروەها حەدیسی دیکە هەیە کە دەفەرمووێ: {أَحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ أَرْبَعٌ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ لَا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ}[2] واتە: [گەورەترین زیکر ئەو چوار وشەیەن: سبحان لله، والحمدلله، ولا اله الا لله، لله اكبر، بەهەرکامیان دەست پێبکەی زەرەری نییە]

زیکر هەڵدەگرێ زۆر بە تێروتەسەلیی قسەی لێبکەین، بەڵام گرنگیی زیکر لەوەدایە کە تۆ هەمیشە دڵت تەڕ و تازە دەبێ. ئنجا وەك گوتم: باشترین جۆری زیکر ئەوەیە هەم بەدڵ بێ و

---

١) أخرجه الترمذي برقم: (٣٣٨٣) وقال: حسن غريب، والنسائي في الكبرى برقم (١٠٦٦٧)، وابن ماجه برقم (٣٨٠٠)، وابن حبان برقم (٨٤٦)، والحاكم برقم (١٨٣٤) وقال: صحيح الإسناد. وأخرجه أيضاً: الديلمي برقم (١٤١٤).

٢) أخرجه أحمد برقم: (٢٠١١٩)، ومسلم برقم: (٢١٣٧)، وابن حبان برقم: (٨٣٥).

هەم بەزمان، بەڵام جاری واهەیە کە شوێنەکە ناگونجێ و تۆ ناتوانی بەزمان بیکەی، ئەوا بەدڵ دەبێ هەر هەبێ.

هەڵبەت یادی خوا کردنێك کە دڵی لەگەڵدا نەبێت، هیچ نییە و، بەرهەمێکی وای نییە، هەر وەك پاڕانەوە و زیکرو قوڕئان خوێندنیش هەروان، ئەگەر بەدڵتدا نەیەت و بیری لێنەکەیەوە، سوودێکی وای نییە.

بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر هەرچۆنێك بێ مرۆڤ دڵەکەشی بۆ ئامادە نەکرێ، بەس بە زمانیش یادی خوا بکا، خێرو پاداشتی هەر هەیە. دەبینی ئەوە هاوکاری دەبێ کە دوایی بیگوازێتەوە بۆ دڵیشی.

ئەوەش کورتەیەك بوو لەسەر زیکر و گرنگیی لە ژیانی مرۆڤدا.




## تێگەیشتن و کارپێکردنی قورئان

شەریف: قورئان باشترین دیاریی خوای پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتیی، چونکە وەڵامی هەموو پرسیارە بنچینەییی و هێڵە گشتییە فیکریی و مەعنەوییەکان و، باسی ڕابردوو و داهاتووی تێدایە، بۆیە لە هەموو سەردەمەکاندا بەبێ دووبارەبوونەوە، زانایانی شارەزا لە قورئان، تێگەیشتنی جیاوازیان هەبووە بۆ ئایەتەکان؛ کە هەموویان بە ڕێژەیی ڕاستن بەڵام هەریەکە بۆ قۆناغ و ئاستی گەشەسەندنی ئەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە. قورئان دەریایەکی بێ بنە و لەگەڵ هەموو سەردەم و کۆمەڵگا و کەسێکدا دەگونجێ، وەك چۆن هەموو ئامێرێك کەتەلۆگ و ڕێنمایی لەگەڵدایە تا بزانی چۆن بەکاردێ! کەتەلۆگ و ڕێنمایی ئەم ژیانەش بریتییە لە قورئان، نەوەك قورئان لە پەڕۆی سەوز وەرپێچین و تۆزی لەسەر بنیشێ،

پیرۆزیی و پێزی قورئان لە کارپێکردنیدایە، فەرمایشت و ئایەتەکانی خوای پەروەردگار کاتێك کاری خۆیان بەتەواویی دەکەن، ئەگەر ئاوێتەی ژیانی تاك و کۆمەڵگا بکرێن. هەر بۆیەش هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، کاتێك قورئانیان لەبەر دەکرد، تا ئایەتێکیان جێبەجێ نەکردبایە، ئایەتێکی دیکەیان لەبەر نەدەکرد، بەڵام بەداخەوە زۆرینەی مسوڵمانان وەك پێویست بەهرە و سوود لە قورئان وەرناگرن.

بابە گیان! مسوڵمان پێویستە تا چەند خۆی سەرگەرمی قورئان بکات و کاریگەرییەکانی قورئان چین؟

بـابـــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کوڕی خۆشەویستم!

ئەمشەو بۆت باسی قورئـان و کاریگـەریی قورئـان دەکـەم لـە ژیانی مرۆڤدا، لە چەند خاڵێکدا:

**یەکەم:** بێگومـان قورئـان دوایـین نوسخەی هیدایـەتی خوایـە کـە بـۆ مرۆڤایـەتیی نـاردووە، دوایـین فەرمایشـتی خۆیـەتی کـە لەگـەڵ مرۆڤایەتییـدا کردوویـەتی، دیـارە بـە درێژایـی مێـژووی بەشەر، خوای بەبەزەیـی لـە ڕێگـای پێغەمبـەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) مرۆڤەکانی دواندوون، کـە خوا پێـی خۆشـە مرۆڤـەکـان چۆن ژیـانی سـەر زەوی بگـوزەرێنن و، دوا پـەیامی خـۆی کـە ناردوویەتی بە پێغەمبەر (محمد)دا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئـەویش لە ڕێگەی جوبریلەوە (علیه السلام) بریتییە لە قورئـان و، لـە زۆر شوێندا، خوای زانا باسی قورئان دەکات کە بیرخەرەوەیـە و پەنـد و ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهانییان:

بۆ نموونە دەفەرمووێ:

**أ.** ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٢٧﴾ التكوير.

واتە: [ئەم (قورئان)ە هیچ شتێك نییە تەنها یادخستنەوە و پەندو ئامۆژگارییە بۆ تێکڕای خەڵکی لە هەموو جیهاندا بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاریی لێ وەربگرن].

هەروەها دەفەرمووێ:

**ب.** ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾ التكوير.

واتە: [بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە ویستی ڕاست بێ و هیدایەت و دامەزراویی و جێگیریی هەبێت].

دیسان هەر لە بارەی قورئانەوە کە بیرخەرەوەیە و ئامۆژگارییە و شیفایە بۆ بەشەرییەت، خوا دەفەرمووێ:

**ج.** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس.

واتە: [ئەی خەڵکینە! بەڕاستیی ئێوە ئامۆژگارییەکی گەورە و گرنگتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە (کە قورئانە) شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشیی دڵ و دەروونەکان و، ڕێ نیشاندە رو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران].

کەواتــە: قورئــان دوا فەرمایشــتی خــوایە، بــۆ هــەموو مرۆڤەکان، بەدرێژایی زەمان و بە پانایی زەمین.

**دووەم:** ئەم قورئانە بە دوو شێوە بە ئێمە گەیشتووە: یەکەم: بە نووسین، دووەم: بە زارەکیی، هەر بۆیە خوا ناوی لە قورئان ناوە (کتاب):

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١﴾ الحجر.

هەروەها ناویشی لێناوە (قرآن)

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١﴾ الحجر.

بۆیەش قورئان ناوی لێنراوە: (کتاب)، چونکە بە نووسراویی بە ئێمە گەیشتووە، لەسەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەلایەن ژمارەیەك لە هاوەڵانی متمانەپێکراویەوە لەسەر بەردی تەنك و پێست، ئەو سوورەتانەیان هەموو نووسیون، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی گوتوون.

هەروەها وێڕای نووسین (کتابة)، بە زارەکیش (شفها)یش پێمان گەیشتووە، بۆیە وەك چۆن ناوی (کتاب) لە قورئان نراوە، واتە (نووسراو) بەهەمان شێوەش ناوی (قرآن)یشی لێنراوە، واتە (خوێنراو، خوێنراوە)، کە هەزاران لە هاوەڵان لە پیاوان و ئافرەتان

هەموو قورئانیان لە بەرکردووەو لە سینەیاندا تۆماریان کردووە بەشێوەی (تواتر) بە ئێمە گەیشتووە.

کەواتە: هیچ دوودڵیی و گومانێك نییە لە قورئاندا لەو کاتەی دابەزیوە تا ئەم کاتە، بۆ سەر سینەی موبارەکی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەك خوا کە لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرمووێ:

﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾﴾ الشعراء.

واتە: [ئەو (کتێب)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە، جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارێ بۆ سەر دڵی تۆ، بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی بە زمانێکی عەرەبیی ڕوون و ڕەوان].

بەبێ هیچ گومان و دوودڵییەك، لەو ڕۆژەوەی خوا قورئانی بۆ سەر سینەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابەزاندووە، تا ئەم لەحزەیە، دوو مسوڵمانی موعتەبەر لە زانایان کێشە و دوودڵییان نییە لەبارەی وشەیەکی قورئان، بەڵکو لە بارەی پیتێکیەوە.

ئەوەیە کە قورئان جیادەکاتەوە لە هەموو کتێبەکانی دیکە کە دەدرێنە پاڵ خوای کاربەجێ، کە ئەوانیش کاتی خۆی ڕێك و ڕاست و چاك بوون، بەڵام مرۆڤ دەستکاریی کردوون.

بەڵام خوا خۆی قورئانی پاراستووه، دەستکاریی نەکریّ، وەك لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرمووێ:

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾ الحجر.

واتە: [بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و بەڕاستیی هەر ئێمەش دەیپارێزین].

شتێك کە خوا بیپارێزێت، دەپارێزرێت.

ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ: بۆ خوا کتێبەکانی دیکەی نەپاراستوون؟

وەڵام: چونکە خوای مەزن کتێبەکانی دیکەی بۆ قۆناغێکی تایبەتی ژیانی بەشەر و، بۆ کۆمەڵگایەکی دیارییکراو و کاتێکی دیارییکراو ناردوون، بەڵام قورئان بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، بۆ پانایی زەمین و بە درێژایی زەمان هاتووه.

بۆیە کتێبەکانی دیکە کە بۆ کۆمەڵگاو عەشیرەتێك و بۆ کاتێکی دیارییکراو نێردراون، ئەگەر بشگۆڕدرێن، زیانی نەبووە، چونکە لە دوای ئەو کتێبە، کتێبێکی دیکە هاتووە و، لە دوای ئەویش کتێبێکی دیکە هاتووه.

بەڵام قورئان بۆیە خوا ڕێی نەداوە دەستکاریی بکرێت و بگۆڕدرێت، چونکە خۆ لەدوای قورئان کتێبێکی دیکە نایەت

بۆ ئەوەی هەڵەکانی ڕاست بکاتەوەو بڵێ: فڵان شوێنی گۆڕدراوە.

خوای کارزان لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرمووێ:

﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾﴾ النمل.

واتە: [بەڕاستیی ئەم قورئانە دەیگێڕێتەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل زۆربەی ئەو مەسەلانەی کە ئەوان تێیدا جیاوازن].

کەواتە: ئێستا (تەورات و ئینجیل و زەبوور) کە دەستکاریی کراون، قورئان پێمان دەڵێ: کوێیان دەستکاریی کراوە، بەڵام ئەگەر قورئان دەستکارییکرابایە، لە دوای قورئان کتێبێکی دیکە نەدەهات، بۆیە خوای پەروەردگار قورئانی بۆ خۆی پاراستووە، بۆیە پارێزراوە، بەڵام پاراستنی کتێبەکانی دیکە عایدی مرۆڤەکان کردوون، وەك لە سوورەتی (المائدە)دا دەفەرمووێ:

﴿بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ المائدة: ٤٤.

واتە: [ڕەببانی و حەبرییەکان، کە فەرمانیان پێکرابوو (لەلایەن پێغەمبەرانیانەوە) کە کتێبی خوا بپارێزن (و ئاشکرای بکەن و نەیشارنەوە و، کاری پێبکەن و، خەڵکی فێر بکەن و

دەستكاریی نەكەن و نەیگۆڕن)].

ئنجا شتێك مرۆڤ بیپارێزێت، ئاوا بۆی دەپارێزرێت، شتێك خواش بیپارێزێت، بە تەواویی پارێزراو دەبێت.

**سێیەم:** خاڵێكی دیكە لە بارەی قورئانەوە ئەوەیە، كە قورئان بۆ ئێمە هەمووی دیارە: (١١٤) سوورەتە و، (٦٢٣٦) ئایەتە، لەسەر ڕای بەهێزی زانایان و، (٧٧١٩٠) وشەیە و پیتەكانی (٣٢١٤٣٩)ن، ئەمەش هەمووی دیارە.

**چوارەم:** خاڵێكی دیكەش ئەوەیە، كە ئەم قورئانە، ڕۆڵە گیان! ئینسان تاكو زیاتر لێی نزیك بێت، زیاتر لە نهێنییەكانی تێدەگات، قورئان وەك ژمارە وایە، سەرەتای هەیە، بەڵام كۆتایی نییە، خوای بێ هاوتا دەفەرمووێ:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: [ئەی محمد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)! بڵێ زاتێ ناردوویەتە خوارێ كە هەموو نهێنیی ئاسمانەكان و زەوی دەزانێت، بەڕاستیی ئەو (خوا) لێبوردەی میهرەبانە].

بـۆیەش ئینسـان دەتـوانێ نهێنیـی ئاسـمانەکـان و زەوی لـە قورئاندا ببینێتەوە: قورئان باسی سەرەتای ژیان دەکات و، باسی سـەرەتای گـەردوون و کۆتـایی گـەردوون دەکـات، لـە سـوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرمووێ:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الأنبیاء.

واتە: [ئایا بێبڕوایان نەیاندی (نـەیان زانیـوە) کـە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوون (یەك پارچە بوون) ئنجا لە یەکدیمان جیاکردنەوە و، فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو، ئنجا ئایا ئەوانە هەر بڕوا ناهێنن؟].

ئەم تاکـە ئایەتـە باسی سـەرەتای گـەردوون و سـەرەتای ژیـان دەکات، ئێستا نوێترین بیردۆزی زانستیی لـە بـارەی پەیدابوونی گـەردوونـەوە، ئـەوەیە کـە پێـی دەگـوترێ (The Big Bang Theory) واتـە: بیـردۆزی تەقینـەوەی گـەورە، کـە دەڵـێن: سـەرەتای ئـەم گەردوونـە (١٣.٧٠٠.٠٠٠.٠٠٠) لـە شـتێکی زۆر بچووکەوە کە پێی دەڵێن: هێلکەی گەردوونیی (البیضة الكونیة - Singularity - سینگولاریتیی) دروست بووە.

٦
# تەوەری

## گرنگترین ئامانج

شەریف: بەبێ هەبوونی ئامانج و ئومێدێکی مەزن لە ژیاندا، مرۆڤ وەك چۆلەکەیەکی نێو گەردەلوول، دێت و دەچێ، بەنێو هەندێ بازنەی گچکەدا دەخولێتەوە. بەرهەم و سەرمایەی لە دونیا و قیامەتدا دیار نابێ. زۆر پێویستە بۆ بەردەوامبوونت لە ژیاندا، ئامانج و گەورەترین ئومێدی ژیانت دیاربێ، ئاڕاستەیەك بەرەو ڕووی هەنگاوبنێی، هیوایەك بەیانیان لە خەو هەڵتستێنێ، ئامانجێك بەردەوام لە مێشکتدا بێ و ووزەت پێ ببخەشێ، گرنگترین ئامانجیش: خوای پەروەردگار لەخۆ ڕازیکردنە، چونکە ئەوە تەنها هۆکاری دروستبوونی مرۆڤە. هەر ئامانجێکی دونیایی کە دایدەنێی، لە ماوەیەکدا پێی دەگەی و دەبینی شتەکە ئەوەندە جێی بایەخ نەبوو کە لێت دەڕوانی. بەڵام گرنگترین ئامانج مرۆڤ لە ژیانیدا دایبنێ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارە، ئەمەش

تاكە ئامانجە هەموو ڕۆژێك هەست دەكەی پێی دەگەی و، بۆ ڕۆژی داهاتوو دەتەوێ زۆرتری لێ وەدەست بێنی، تاكە شتە مرۆڤ لێی بێزار نابێ و خاڵی كۆتایی و وەڕەزبوونی نییە. بە ئامانجكردنی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار، هەوڵدەدەی هەموو ئەو شتانە بكەی باش و چاكن و، خۆت بەدوور دەگری لە هەموو خراپە و پیسییەك، ئەو كات هەموو لایەنەكانی دیكەی ژیانت بۆخۆیان ڕاستەڕێ دەبن.

بابە گیان! پێت باشە زۆرترین گرنگی بەچی بدرێ و گەورەترین ئامانج و ئاواتی مرۆڤ چی بێ لەم ژیانەدا؟

بـابــم: زۆر باشە، شەریف گیان!

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله، وصلى الله تعالى وسلم وبارک على رسول الله محمد واله المهتدين بهداه.

کاك شەریف گیان!

ئەمشەو لەبەر ڕۆشنایی ئایەتێك لە سوورەتی (الزمر)دا بۆت باسی ئەوە دەکەم کە چۆن مرۆڤ کاتێك سەرکەوتوو دەبێت لە ژیانیدا، کە یەك ئامانج و مەبەستی هەبێ، هەموو تواناکانی خۆی لەسەر چڕبکاتەوە. چونکە زانایانی دەروونزان دەڵێن: کەسانی بلیمەت و سەرکەوتوو ئەوانەن کە بتوانن زیهن و فیکر و بیر و دڵی خۆیان لەسەر شتێك چڕبکەنەوە. بەڵام ئەوانەی فیکریان بڵاوە، بەملاو بەولادا دەچێ وەك چۆن ئاوێك کە زۆر بڵاو دەبێ بە عەرزێدا، قووڵایی نییە و، ناگونجێ ئەو کاریگەرییەی هەبێ، بەهەمان شێوە مرۆڤ کە فیکری زۆر بڵاو بوو، جارێك لێرەو جارێك لەوێ، شتێك لێرەو شتێك لەولا، ژیانی بڵاو دەبێ.

جا خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرمووێ:
﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًاۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾﴾ الزمر.

واتە: (خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: پیاوێك چەند هاوبەشێکی تێدا بەشدارن کە چەند کەسن (چەند خاوەنن) و پێکەوەش ناکۆکن، پیاوێکیش کە تایبەت بەردەستیی و هاوکاریی پیاوێك بکات، خزمەتی بکات، کارەکانی بۆ ڕاپەڕێنێ ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾ ئایا حاڵیان وەك یەکە؟ دوایی دەفەرمووێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ستاییش بۆ خوا بەڵکو زۆربەیان نازانن).

کوڕی خۆم! ئەوە خوای پەروەردگار وێنە دێنێتەوە بۆ بابای هاوبەش بۆ خوادانەر، موشریك و، بابای خوابەیەکگر، (مُوَحِّد). ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێت، هاوبەشێك، دووان، سیان، ئەوە وەك ئەو کەسە وایە کە چەند خاوەنێکی هەبێ و، خاوەنەکانی پێکەوە ناکۆك بن، هەر کامێکیان کارێکی پێبسپێرێ دژی کارەکەی دیکە، کە بێگومان سەری لێدەشێوێ، ئەوەی دیکە کە خواپەرستە خۆی بۆ خوا یەکلایی کردۆتەوە، وەك کەسێك وایە کە کارەکانی کەسێك ڕادەپەڕێنێ و هاوکاریی یەك کەس دەکات و خزمەتی یەك کەس دەکا، ئینسان لە ژیانیدا ئەگەر خوا پەرست بێت، بە تەئکید نابێت

هیچ شتێکی دیکە بینێتە ڕیزی خوای پەروەردگار، ئەگەرنا بە موشریك لەقەڵەم دەدرێت. جا نەك هیچ کەسێك بەڵکو هیچ شتێکیش، هەروەها هیچ شتێکی ماددییی و مەعنەویی، هەر بۆیە لە قورئاندا خوای پەروەردگار کەسێك کە شوێن ئارەزووی خۆی دەکەوێ، لەسەر حیسابی حەق و شەرع، ئەو کەسە بە هەوا و ئارەزوو پەرست دادەنرێ، خوا دەفەرمووێ: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ الفرقان: ٤٣، لە دوو شوێن لە قورئاندا ئەو تەعبیرە هاتووە: لە سوورەتی (العنکبوت)دا هاتووە و، لە سوورەتی (الجاثیة)شدا هاتووە: (ئایا ئەو کەسەت بینیوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی؟) ئنجا دەبێ ئینسان وریا بێ کە لە ژیانیدا ڕازییکردنی پەروەردگار بکاتە ئامانج و، هەموو توانەیەکانی خۆی بەرەو ئەو ئامانجە ئاڕاستە بکات.

لەو بارەوە فەرمایشتێکی پێغەمبەریش هەیە (علیه الصلاة والسلام) کە زۆر باش تیشك دەخاتە سەر ئەو ئایەتە موبارەکە، ئەو ئایەتەی لە سوورەتی (الزمر)، کە پێغەمبەر دەفەرمووێ: {مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمًّا وَاحِدًا ؛ هَمَّ الْمَعَادِ، كَفَاهُ اللَّهُ هَمَّ دُنْيَاهُ، وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوَالِ الدُّنْيَا لَمْ يُبَالِ اللَّهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهِ هَلَكَ}[1] یانی: [هەرکەس خەمەکانی کردنە یەك خەم، خەمی ڕۆژی

---

١) أخرجه ابن ماجه برقم:٤١٠٦، وحسنه الألباني.

دوایـی، خـوا خـەمی دنیـای لـەکۆڵ دەکاتـەوە، هەرکەسـێکیش خەمـەکانی بـەحاڵ و باڵـەکانی دنیـادا بپـرژێن، خـوا گرنگیـی پێنـادات لــەکام دۆڵیانــدا دەفــەوتێ. (بەڵام دونیـا واتە: ئەو پێداویسـتییانەی کە هەینـی نەك وەك دەڵـێن: دونیـای حەڕام و شوبهەدار بەڵام یانی خوا پێداویستییەکانی دەرەخسێنێ)].

ئنجا کوڕی خۆم! ئینسان ئەگەر قیبلەی دڵی بەرەو خوای پەروەردگـار بێـت و، ئەگەر قیبلەنماکەشـی بریتـی بێـت لە ڕازییکردنـی خـوا، یـانی ڕوو بکـاتە خـوا، بەڵام چ شـتێك قیبلەنمای بێت ئەوە ڕێڕەوی بۆ دیاری دەکات: ڕازییکردنیی خوا لە هەرشتێك دابوو، لای ئەوە بگرێ، بۆیە خوای پەروردگار کە مەدحی هاوەڵان دەکا (خوالێیـان رازی بـێ) بەوە وەسفیان دەکا دەفەرمووێ:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الفتح.

واتە: [موحەممەد نێردراوی خوایە، ئەوانەشی کە لەگەڵیدان (واتە: هاوەڵەکانی بە پیـاو و ئـافرەتەوە) لەسـەر کـافران تونـدن لەکـاتی ڕووبەڕوو بـوونەوەدا و، لە بەینـی خۆیانـدا بەڕەحـم و بەزەیین، هەمیشە تۆ بە کڕنووشبردوویی دەیانبینی، ئەوەی کە بە ئاواتی دەخوازی کردوویانە بە ئامـانج و مەبەسـتیان، بـریتییە لە بەخشش و ڕەزامەندیی خوا].

زۆر گرنگە کە ئینسان خۆی بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا یەکلایی بکاتەوە. هەروەها لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرمووێ: ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ﴾ واتە: [ڕەزامەندیی خوا لە هەموو شتێك گەورەترە].

ئنجا ئەوە ئەو ڕێیە ڕاستەیە کە ئینسان دەبێت بیگرێتە بەر، یەکەم ڕازییکردنی خوای پەروەردگار بکاتە قیبلەنمایەك، بیکاتە ئامانجی ژیانی، دڵی خۆیشی ڕوو پێ بکاتە پەروەردگار و، دەربەستی ئەوە نەبێت کە خەڵك دەڵێت چی!

هەتا ئەهلی تەسەووف و عیرفان دەڵێن: یەکێك لە نیشانەکانی تەزکییەبوونی نەفسی مرۆڤ، ئەوەیە کە قسەی خەڵکی وەك یەك بێت بۆی، واتە: لەلای گرنگ نەبێ کێ مەدحی دەکات یان زەمی دەکا، ئەگەر مەدحیان کرد بڵێ: خوایە! لەوەی کە گومانم پێدەبات چاکترم بکە، ئەگەر زەمیشیان کرد بڵێ: خوایە! لەوەی کە دەیڵێن چاکم بکەو، یارمەتیم بدە وا نەبم.

یانی: ئینسان دەبێ زۆر دەربەستی ئەوە نەبێت، کە خەڵك چ دەڵێ و، چ دەکا؟ بە خەڵکەوە زۆرماندوو نەبێ، خۆیشی بپارێزێت، بەڵام وەك گوتراوە: (رضا الناس غاية لا تدرك) یانی: ڕازیی کردنی خەڵك ئامانجێکە، هەرگیز نایەتە دی.

ئایا مەسەلەی باب و کوڕەکەت بیستووە؟ باب و کوڕێك جارێك بە سەفەر دەچن، گوێدرێژێکیان پێ دەبێ، بابەکە دەڵێ: ڕۆڵە! با هەردووکمان سواری گوێدرێژەکە نەبین و با ماندوو نەبێ، کوڕەکە دەڵێ: باشە بابە، پیاوەکە سوار دەبێ و کوڕەکە دەڕوا، کۆمەڵێك دەڵێن تەماشا ئەو پیاوە دڵ ڕەقە ناکەن، بۆ خۆی سواری ئەو گوێدرێژەی بووە بەڵام ئەو کوڕەی بە پێیان دەڕوا؟ دەڵێ: کوڕم! با خەڵك گلەییمان لێ نەکات، تۆ سواربە و من بەپێیان دەڕۆم. دەگەنە کۆمەڵێکی دی دەڵێن: ئەو کوڕە دڵ ڕەقە تەماشا ناکەن! ئەو پیاوە پیرە بە پێیان دەڕوا و بۆخۆی سوار بووە؟ ئنجا دەڵێ: کورم با هەردووکمان دابەزین، گوێدرێژەکەمان پێش خۆمان دەین، دەگەنە کۆمەڵێکی دی دەڵێن: ئەوانە چەند بێ ئەقڵن، ئەی گوێدرێژ بۆچییە، بۆ سواربوونێ نییە؟ دوایی بابەکە دەڵێ: وەرە با هەردووکمان سوار بین، دیسان خەڵکێکی دیکە دەڵێن: تەماشا ئەو پیاوە دڵ ڕەق و کوڕە، بە هەردووکیان سواری گوێدرێژێك بوون، دوایی دەڵێ وەرە ڕۆڵە! چۆن بە بەرژەوەندیی دەزانین با وابکەین و، گوێ بە قسەی ئەم و ئەو نەدەین.




# حەزو ئارەزووەكان و مامەڵەیەكی دروست

شــەریف: هەمــوو مرۆڤێكــی تەندروســت بەپێــی تەمەن و ئەو ژیـنگەیەی تێـیدا گەوره دەبیٚ، حەزو ئـارەزووی جیـاوازی دەبـن، ئەوەش شتێكی سروشتییە. ئەوەی كە سروشتیی و تەندروست نییە ئەوەیە كە مـرۆڤ نەزانـیٚ چۆن مـامەڵە لەگەڵ ئـــــارەزوو و داواكـــــارییە جەســــــتەیی و مەعنەوییەكانیدا بكـات. لە پێكهاتەی جەستەی مرۆڤدا دوو حكومڕان هەن: عەقڵ و دڵ. عـەقڵ دابەش دەبیٚ بـۆ چەنـد بەشـێك و هەر بەشـە سـەرقاڵی شـتێكە و دڵـیش لەگەڵ ئەنـدامەكانی دیـكە و پێـنج هەسـتەكاندا لەژێـر كـاریگەریی یەكتـردان. مەبەسـتم ئەوەیە ئەگەر مـرۆڤ خۆی كۆنەكاتەوە و جڵەوی تەواوی دەسەڵاتی بڕیـاردانی جەستەی نەگرێتە دەست، دەبێتە بووكەڵە بەدەست نەفسی خۆیەوە، پەرتەوازە دەبیٚ، ئەو قسەیەك دەكاو دڵ گوێی بۆ

ناگرێ، دڵ شتێك دەڵێ و عەقڵ کەللەڕەقیی دەکات، هەر ئەندامە بەلایەکدا دەڕوا و ماڵ تووشی دارمان دەبێ. گرنگە هەموو ئەندامەکانی جەستەت گوێت بۆ بگرن و لە قسەت دەرنەچن. ئەوەش پێویستی بە خۆڕاهێنان و خووپێوەگرتنە، لە تەوەرەکانی داهاتوودا زیاتر تیشکمان خستۆتە سەر ئەم باسە. بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە پرسیارم لە بابم کرد:

بابە گیان! چۆن یەکێك بتوانێ حەز و داواکارییە جەستەیی و مەعنەوییەکانی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و جڵەویان بکات؟

بابم: زۆر باشە،

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

**الحمدلله وصلى الله تعالى وسلم وبارک على رسول الله محمد وآله ومن اهتدى بهداه.**

کاك شەریف گیان! ئەمشەو بۆت باسی ئەوە دەکەم کە ئینسان چۆن لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆی، لەگەڵ داخوازییە غەریزەییەکانی، هەروەها داخوازییە ڕووحیی و مەعنەوییەکانیدا مامەڵە بکات. دیارە خوا (سبحانه وتعالى) ئینسانی لە دوو

پێکهاتەی سەرەکیی دروست کردووە کە بریتین لە ڕووح و لە جەستە. ڕووح، ئێمە نازانین چییە؟ وەك خوای پەروەدگار لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرمووێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الإسراء.

واتە: [لە بارەی ڕووحەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە و، بە ئەندازەیەکی کەمیش نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە] واتە: بەو ئەندازەیە کەمە زانیارییەی کە پێتان دراوە، ناتوانن دەرکی حەقیقەتی ڕووحی پێبکەن.

پێکهاتەی دووەمی مرۆڤ، بریتییە لە جەستەی، جەستەش دیارە دەیبینین و بەرچاوە و لە خاکی ئەو زەوییە دروست بووە کە لە سەری دەژین، وەك دەفەرمووێ: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ﴾ لەو خاکە دروستمان کردوون ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ﴾ جەستەکەتان دەگێڕینەوە نێو خاك، بەڵام بۆ ڕووح دەفەرمووێ: ﴿وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ الحجر:٢٩.

واتە: لە ڕووحێك کە دروستکراوی تایبەتی خۆمە، فووم بەبەردا کردووە.

داخــوازیی جەســتەیی لە شــەریعەتی ئیســلامدا دژایەتیــی نەكراوە و، شەریعەت دانی بەوەدا هێناوە كە ئینسان بۆ وێنە: پێی خۆشە ماڵ و سامانی هەبێ، پێی خۆشە ماڵ و خێزانی هەبێ، پێی خۆشە جوان و ڕێك بێت، پێی خۆشە موحتاجی خەڵك نەبێ، پێی خۆشە بەهێز بێت، پێی خۆشە زانیاریی هەبێ، پێی خۆشە بەرگ و پۆشاكی جوانی هەبێ، پێی خۆشە لەش ساغ بێت، ئەوانە هەمــووی ئــایەتی خــوای پەروەردگــار، یــان فەرمایشتی پیغەمبەریان لەسەرە (علیه الصلاة والسلام) نەك هەر ئەوەنــدەش بەڵكــو خــوا (سبحانه وتعالی) لە قوڕئانــدا فەرمــانی كردووە كە دەبێ بخۆین و بخۆینەوە و، بەوە كە دەبێ مرۆڤەكان هاوســەرگیریی بــكەن و، بەوە كە دەبــێ بەرگ و پۆشــاكی جوانمان هەبێ و، بەوە كە دەبێت ئەو شتانەی كە سوودبەخش و پاك و چاكن، لێیان بەهرەمەند بین، هەڕەشەشی كردووە لەوانەی شــتانێك كە خــوا حەڵاڵــی كــردوون، قەدەغەیــان دەكەن، لە سووڕەتی (المائدة)دا خوا دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾﴾ المائدة.

واتە: [ئەی ئەوانەی بڕواتــان هێنــاوە! ئەو شــتە پــاك و چاكــانەی خــوا بــۆی ڕەوا كــردوون، قەدەغەیــان مەكەن و، سنوورشــكێنیی مەكەن، بێگومــان خــوا سنوورشــكێنانی

خۆشــناویێت] واتە: ئەوانەی نیعمەتەکــانی خــوا لە خۆیــان یــان لەخەڵکی قەدەغە دەکەن، سنوورشکێنن!

ئەو ئــایەتەش لەو بــارەوە هــاتە خــوار: کاتێــك کۆمەڵێــك لە هاوەڵان جارێك لە سەفەرێك بوون، بە شوێنێکی مێرگ و کانی و کانیــاودا تێــپەڕین، گوتیــان: ئەرێ بــۆ لێــرە نەمێنیــنەوە، لەو سەرکانی و کانیاوە بۆخۆمان بژین، واز لە مــاڵ و منــداڵ و نێو کۆمەڵگا بێنین، بۆ ئەوەی تووشی گوناح نەبین، ئنجا خۆشمان بخەسێنین بــۆ ئەوەی پێوستمان بە ژن و منــداڵ نەبێ، دوایــی گوتیان: چۆن وابکەین؟ با بگەڕێینەوە لای پێغەمبەر و ڕاوێژی لەگەڵدا بکەیـن داخۆ ڕای چییە؟ چوونەوە و پرسییان، خـوای پەروەردگــاریش ئەو ئــایەتەی دابەزانــد کە شــتی وا قەدەغەیە لە ئیسلامدا.

هەروا بۆ بەرگ و پۆشاك خوای بەرزی مەزن دەفەرمووێ:

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾ الأعراف.

واتە: [ئەی وەچەی ئــادەم! لەلای هەر مزگەوتێــك جــوانیی خۆتان وەربگرن (خۆتان بڕازێننەوە و پۆشاکی باش لەبەر بکەن) و، بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەکەن].

هەروەها لەبارەی هاوسەرگیرییەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم.

واتە: [لە نیشانەکانی پەروەردگارێتی خوا، ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەرانی بۆ هێناونەدی، بۆ ئەوەی بەهۆی یەکدییەوە سوکناییتان بێ، دڵتان ئارام بگرێ و، خۆشەویستیی و بەزەییشیی لە نێوانتان داناوە، لەوەدا نیشانە هەن بۆ ئەو کەسانەی بیر بکەنەوە].

هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمووێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ... ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة. واتە: [ئافرەتان بۆ ئێوە پۆشاکن و، ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن]. واتە عەیبی یەکدی دادەپۆشن و، بەکەڵکی یەکدی دێن.

هەروەها لە مەسەلەی ماڵ و ساماندا، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة. واتە: [دەستمایەکانتان بۆخۆتان، نە زوڵم بکەن (لە خەڵکی) نە با زوڵمیشتان لێبکرێ (لە ڕووی دارایەوە)].

هەروەها پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ڕۆژێك فەرمووی: {لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ} واتە: [هەر کەسێك بەقەدەر قورسایی گەردێك خۆبەزلگریی لە دڵدا هەبێ، ناچێتە بەهەشت] پیاوێك گوتی: ئینسان حەز دەکات پۆشاکی جوان بێت و، پێڵاوی جوان بێت! پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلا ) فەرمووی: {إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ}[1] واتە: [خوا جوانە و، جوانییشیی خۆش دەوێ، خۆبەزلگریی بریتییە لەوەی حەق بخەنە بەر چاوت و ڕەتی کەیەوەو ڕەفزی بکەی و، خەڵکی بەکەم تەماشا بکەی، ئەوە خۆبەزلگرییە].

ئەمما پێت خۆش بێ بەرگ و پۆشاکت جوان بێ، بۆنت خۆش بێت، لەشت ساغ بێت، جێ و ڕێت باش بێت، ئەوانە هیچیان نەك شەریعەت ڕێی لێ نەگرتوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە: شەریعەت فەرمانیشی پێ کردوون. ئێمە ئێستا دوو فەرزمان هەر لە پێنج فەرزەکان، لە پێنج پایەکانی ئیسلام، بە ئینسانی دەوڵەمەند نەبێ جێبەجێ نابێ، یەکیان: زەکات، زەکات لە بابای دەوڵەمەند دەکەوێ، دووەمیش: حەج، کەسێك

١) أخرجه مسلم برقم (٩١)، والترمذي برقم (١٩٩٩)، وقال: حسن صحيح غريب. وأخرجه أيضًا: وابن حبان برقم (٥٤٦٦).

كە ئیمكانییەتی ماددیی هەبێ، حەجی بۆ دەكرێ و لەسەری واجب دەبێ.

بەڵام ئەوەی كە گرنگە لە وەڵامدانەوەی داخوازییە جەستەییەكاندا، ئەوەیە كە ئینسان تێنەپەڕێنێ، خوای میهرەبان دەفەرمووێ: ﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ ...﴿٣١﴾﴾ الأعراف. واتە: [بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەكەن].

هەروەها لە هەموو شتەكانی دیكەشدا، بۆ وێنە دەفەرمووێ: ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ...﴿٥٧﴾﴾ البقـرة. واتە: [لەو شتە پاك و چاكانەی پێمان داون بخۆن].

واتە: خواردنی پیس مەخۆن، شتی خراپ بەكار مەهێنن، چاوت لە ماڵی حەڕام نەبێت، چاوت لە تێركردنی غەریزەكان نەبێت بە شێوەی قەدەغەو حەڕام، ئەگەرنا بەشێوەی حەڵاڵ و چاك ئاساییە، هەتا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلا ) فەرموویەتی:

{وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرًا}[1].

---

١) أخرجه مسلم برقم (١٠٠٦).

واتە: [یەكێكتان دەچێتە لای هاوسەری، ئەوەش بۆی بە خێر و پاداشتە، گوتیان: چۆن یەكێك لە ئێمە ئارەزووی جێبەجێ دەكات و پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: ئەدی ئەگەر ئارەزووەكەی لەحەرامدا دانێ، گوناحی ناگات؟ (گوتیان: با)، فەرمووی: بەهەمان شێوە لە ڕێی حەڵاڵەوە بێت پاداشتی هەیە].

ئەوە بەنسبەت داخوازییە جەستەییەكانەوە، داخوازییە ڕووحییەكانیش، بە حەقیقەت ئەوەی ڕووح پێی تێر دەبێ و، پێی دادەسەكنێ و ئۆقرە دەگرێت، تەنیا پەیوەندییە لەگەڵ خوادا، ئەگەر نا كابرا ماڵ و سەروەت و سامانی هەموو دونیای هەبێ، هەر دەڵێت: با هی دیكەش بێت، دەسەڵاتی زۆری هەبێ، چاوی لە هی زیاترە، هەر شتێكی هەبێ، چاوی لە هی زیاترە. بەڵام ئەو دڵەی ئینسان، ئەو ڕووحەی ئینسان، بەیادی خوا ئارام دەگرێ: ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ الرعد. واتە: [ئاگاداربن! تەنیا بە یادی خوا، دڵان ئارام دەگرن].

یادی خواش بەس ئەوە نییە مرۆڤ دانیشێت و زیكر بكا! نا، یادی خوا یانی: پەیوەندیی لەگەڵ خوا، بەندایەتیی بۆ خوا، ڕووكردنە خوا، پەرستنی خوا، بەوە دڵی ئینسان ئۆخژن و ئارامیی بۆدێ و، بە هیچ شتێكی دیكە دڵی ئینسان ئاوا داناسەكنێ و ئۆقرە ناگرێ.

وەك چۆن جەستە لە خاك پەیدابووە و بە و شتانەش کە لە خاك پەیدا دەبن تێردەبێ، پرۆتین و کاربۆهیدرات و شیرینیی و کانزاکان و ڤیتامینەکان و...هتد، بەهەمان شێوە ڕووحیش لە خواوە هاتووە و بە پەیوەندییش لەگەڵ خوادا، ئارام دەگرێ و ئۆخژنیی و سوکنایی بۆ دێت.

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە داخوازییە ڕووحیی و جەستەییەکانمان، لە شیرازەی شەرعدا و لە ڕووی شەرعەوە، تێربکەین و زێدەڕۆیی نەکەین و چاومان لە حەرام و شتی خراپ نەبێ.

والسلام علیکم ورحمة الله




## هاوسەنگیی نێوان ڕووح و جەستە

شەریف: لە تەوەرەکانی پێشووتر باسمان لە لایەنی مەعنەویی و ڕووحیی مرۆڤ کرد: لە تەوەری (حەوتەم)دا باسی حەز و ئارەزووە جەستەیی و مەعنەوییەکانمان کرد. لەم تەوەرەدا هەردووکیان بەیەکەوە گرێدەدەین. مرۆڤ زۆر جار لاتەڵ دەبێ، لەسەر حیسابی جەستە گرنگی بە لایەنی مەعنەویی دەدا، یان بەپێچەوانەوە. وەك عەرەبانەیەك بەلایەکدا هاتبێ و ناتوانێ بجووڵێ. مرۆڤیش کاتێك تووشی ئەو ناهاوسەنگییە دەبێ، پەکی دەکەوێ، باری لار دەبێ لە ژیاندا و لە ناخەوە هەست بە نائاسوودەیی و گرفت دەکات. مرۆڤ بۆ بەردەوامبوونی لە هەر شتێکدا پێویستی بە هاوسەنگییە، تەنها ئەوەش تەمەنی شتەکان زیاد دەکات.

بابە گیان! پێم خۆشە بۆم باسی ئەوە بکەی چۆن مرۆڤ هاوسەنگیی نێوان ڕووح و جەستە بپارێزێ؟

بــابـــم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمد لله وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه من الأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم لقاء الله.

کاك شەریفی کوڕم! ئەمشەو لەماوەی چەند دەقەیەکدا بۆت باسی مەسەلەیەکی گرنگ دەکەم لەژیانی هەر ئینسانێکدا، ئەویش بریتییە لە پاراستنی هاوسەنگیی لە نێوان ڕووح و جەستەدا، دیارە دوێنێ شەویش لەو بارەوە شتێکم بۆ باسکردی بەڵام ئەمشەو بە دیارییکراویی باسی ئەوە دەکەم کە مرۆڤ بەوە بەختەوەر دەبێت و، بەوە ڕاست و دروست دەبێت کە کەسایەتییەکی هاوسەنگی هەبێت و، هاوسەنگیی ڕابگرێت لە نێوان داخوازییەکانی ڕووح و جەستەیدا. ئەگەر تەماشای مێژووی مرۆڤایەتیی بکەین، دەبینین کە بە زۆریی بەشەرییەت یان بەلای جەستەدا شکاوەتەوە، لەسەر حیسابی لایەنی ڕووحیی و مەعنەویی، یان بەلای ڕووحدا شکاوەتەوە لەسەر حیسابی جەستە و لایەنی ماددیی. بەڵام بێگومان وەك چۆن باڵندە بە دوو باڵان نەبێ، نافڕێ، مرۆڤیش خوا وای خوڵقاندووە لە ڕووح و جەستە پێك دێت و، دەبێت ئاگاشی لە هەردووکیان بێت، بەبێ پاراستنی مافی هەردووکیان، تووشی لاتەڵیی و لاسەنگیی

دەبێت، وەك چۆن بارێك كە دەیخەنە سەر پشتی وڵاخێك، یان هەر شتێك كە دوو لای هەبن، دەبێت تەرازوو ڕابگیرێت، ئەگەرنا بە لایەكیدا دەكەوێت، لار دەبێت و دەكەوێت، خوای پەروەردگار لە دوو ئایەت لە سوورەتی (القصص)دا، ئەو ڕاستییەمان بۆ بەرجەستە دەكات، كە باسی (قاروون) دەكەن، كە قاروون لە قەومی مووسا بوو، لە بەنوو ئیسرائیل بووە و لێیان هەڵگەڕاوەتەوە، قەومەكەی ئامۆژگاریی دەكەن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلۡعُصۡبَةِ أُوْلِي ٱلۡقُوَّةِ إِذۡ قَالَ لَهُۥ قَوۡمُهُۥ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ۝٧٦ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ۝٧٧﴾ القصص.

ئەم دوو ئایەتە موبارەكە یەك بەرنامەی تێر و تەواویان تێدایە بۆ پاراستنی هاوسەنگیی لە نێوان دونیا و دوارۆژداو، داواكاریی و داخوازییەكانی جەستەو ڕووحدا، مانای ئایەتەكە بەم شێوەیە، خوا دەفەرموویت:

[قاروون لە گەلی مووسا بوو لێیان هەڵگەڕایەوەو ستەمی لێكردن، (واتە: هەر لە بەنوو ئیسرائیل بوو، بەڵام دایە پاڵ

فیرعەون لەپێناو بەرژەوەندیی ماددیی وەك چۆن هەندێك لەو بازرگانانەی ئێستا لەگەڵ حوکمڕانەکاندا ڕێکدەکەون و لەگەڵیاندا دەبنە شەریکەدز، کاسبیی دەکەن بۆ ئەوان و بەناوی خۆیانەوە تەواو دەبێت، بۆ ئەوەی ناوی حوکمڕانەکە بەد نەبێت، قارِوونیش یەکێك بوو لەوانەی لە پەنای دەسەڵاتێکی خۆسەپێندا، گەندەڵیی کردووەو سەروەت و سامانێکی زۆری وەسەریەك ناوە). خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾ القصص: ٧٦.

واتە: [هێندەمان خەزێنە دابوونێ کە خەزێنەکانی، عەمبارەکانی کە زێڕ و زیوەکەی تێدا هەڵگرتبوون، کۆمەڵە پیاوێکی بە قووەت ماندوو دەبوون تاکو هەڵیان دەگرت].

ئنجا دەفەرموویێت: ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ﴾ القصص: ٧٦. [خەڵکەکەی پێیان گوت: زۆر دڵخۆش مەبە] (فَرَحْ) ئەوپەڕی دڵخۆشییە، یانی: بە ماڵ و سامانی دونیا زۆر دڵخۆش مەبە، قەیناکات دڵت پێی خۆش بێت، بەڵام زۆر دڵخۆش مەبە چونکە ئەوپەڕی دڵخۆشیی ئینسانی ئیماندار دەبێ بە شتی مەعنەویی و ڕووحیی و پاداشتی ڕۆژی دوایی بێت، چونکە دونیا شتێکی زوو تێپەڕە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ القصص: ٧٦. واتە: [بە دڵنیاییەوە خوا ئەوانەی خۆشناوێت زۆر دڵخۆش دەبن و بوغرا دەبن].

دوایـی پێـی دەڵـێن: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾ القصـص: ٧٧ [لەوەدا کە خـوا پێـی داوی، مەنزڵگـای دوارۆژی پێ بەدەست بێنە، واتە: ماڵ و سامانەکەت بکە بە ئامرازێك و بە هۆکارێك کە پاداشتی خوا و بەهەشتی خوای پێ بەدەست بێنیت.

﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا﴾ القصص: ٧٧ [بەشی خۆشت لە دونیـادا فەرامـۆش مەکە] واتە: ئاگـات لە مـافی جەسـتەو حەقی خۆیشت بێت، ﴿وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ﴾ القصـص: ٧٧ چـاکەش بـکە وەك چۆن خـوا چـاکەی لەگەڵـدا کـردووی، ﴿وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ القصـص:٧٧. مـاڵ و سـامانەکەت بـۆ تێکـدان و خراپەکـاریی لە زەویـدا بە کـارمەهێنە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ القصـــص:٧٧. واتە: [بەدڵنیـاییەوە خــوا تێکــدەرانی خۆشناوێ].

پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) یەکێك لە هـاوەڵانی (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) (عثمـان بـن مظعـون) بیسـتبووی کە شـەوانە ناخەوێـت و شـەو نـوێژ دەکـات و، ڕۆژیـش هەر بەڕۆژوو دەبێت، ئامۆژگاریی کردو فەرمووی:

{إنَّ لِعَيْنِكَ عَليكَ حقاً، و إنَّ لإهْلِكَ عَليكَ، حَقاً، وإنَّ لِبَدَنِكَ

عَلَيْكَ حقاً، وإنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حقاً، فَأعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍ حَقَّهُ}[١]
واته: [چاوت مافی لەسەرتە، جەستەت مافی لەسەرتە، ماڵ و منالیشت مافی لەسەرتە، میوانیشت مافی لەسەرتە، هەرکەسەو حەقی خۆی پێ بدە].

ئنجا ئەو ڕێگە ڕاستە، کە ئینسان هاوسەنگیی ڕابگرێت لە نێوان ڕووح و جەستەدا، تەنیا بە پابەندیی بە شەریعەتەوە دەکرێت، ئەگەر ئینسان لە قورئان و سوننەت تێبگات، چونکە خوا (سبحانه وتعالی) بەدیهێنەری ئێمەیە، پەروەردگاری ئێمەیە و دەزانێ کە چۆن مافی جەستە و مافی ڕووح، هەردووکیان بە هاوسەنگیی جێبەجێ دەکرێن. خوای پەروەردگار یارمەتییمانبدات زیاتر لە قورئان و لە سوننەت و، شەریعەت تێبگەین، کە قورئان، ئیسلامی بە شێوەی تیۆریی (نظري) تێدایە و، ڕێبازی پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە شێوەی بەرجەستەکراویی، ئیسلامی تێدایە، بۆیە هەتا لە قورئان ڕامێنین و، هەتا زیاتر ئاشنابین بە ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله عیلە وسلم)، بەو ڕێگا ڕاستەی خوا و، بەو حاڵەتی هاوسەنگییە، زیاتر شارەزا دەبین و، زیاتر بەرچاومان ڕوون دەبێت، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێت.

وصلى الله على محمد
وعلى آله وصحبه أجمعين والحمد لله رب العالمين

---

١) أخرجه أبو داود برقم: (١٣٦٩)، وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (٢٦٣٥١).




## ئافرەت و پیاو،
## هاوڕێیەتیی و هاوسەرگیریی

شەریف: هاوسەرگیریی یەکێکە لە گرنگترین و پێویستترین قۆناغەکانی ژیانی هەر مرۆڤێکی عاقڵ، هەندێجار دایك و باب زەخت لە منداڵەکەیان دەکەن و پێیان وایە: ئەگەر منداڵەکەیان هاوسەرگیریی بکات، هەموو شتێك باش دەبێ و هاوسەرگیریی چارەسەرە، بەڵام پێم وایە: نە تەمەنێکی دیارییکراو هەیە بۆ هاوسەرگیریی، نە هاوسەرگیریی بەبێ ئامادەسازیی چارەسەرە، کاتێك یەکێك باڵغ بێ و هەست بە ئەرك و بەرپرسیارییەتیی بکات، ئامادەکاریی ڕووحیی و فیکریی و ماددیی بکات، ئەو کات تاکو زووتر هاوسەرگیریی بکات باشترە، بەڵام ئەگەر زەمینەسازیی تەواو نەکرابێ، ئەو هاوسەرگیرییە، وەك ماڵی قەڵب دەبێتە بەڵا. هەروەها

سەرنجم داوە ئەو کەسانەی لە هاوسەرگیرییدا سەرکەوتوو نابن، چەند جۆرێکن: هەیانە تەنها لە بیری شەودان، بەڵام هەموو ئارەزوویەکی جەستەیی سنووری هەیە، ئەگەر پارەی هەموو دونیا هی تۆ بێ، تەنها دەتوانی ڕێژەیەکی دیاریکراو خواردن بخۆی، ئەگەر هەموو دونیا موڵکی تۆبێ، ڕێژەیەکی کەم دەتوانی چێژ لە دونیا وەربگری، چونکە ئەم جەستەیەی ئێمە، جەستەیەکی کاتییە و بۆ ژیان و قۆناغێکی کاتیی دروستکراوە.

یان هەیە ئەوەندە لەژێر کاریگەریی ڕۆژئاوا، یان فیلمە تورکیی و ئێرانییەکانە، پێی وایە دەتوانێ وەك ژیانی نێو فیلمەکان بژی، بەڵام کە دەکەوێتە نێو ئەمری واقیع و دەبینێ ژیانی ڕاستیی بەرپرسیارییەتی و ئەرکە، تووشی بێئومێدیی دەبێ. زۆر گرنگە پیاو و ئافرەت ئامادەکاریی بۆ هاوسەرگیریی بکەن و، بە فراوانیی بیر لە هاوسەرگیریی بکەنەوە و ژیانیش بۆ کەس نابێ بە بەهەشت، هەر کەسێکیش نییەتی باش و خێری هەبوو، خوای پەروەردگار بەردەوام کارئاسانیی بۆ دەکات و ئامرازەکانی بۆ دەڕەخسێنێ.

بەداخەوە بە زۆریی خەڵکی ئێستا، پێش هاوسەرگیریی بە ناوی یەکدی ناسیینەوە، هەرچی خۆشەویستیی و لاواندنەوەیان هەیە سەرفی دەکەن، دوای هاوسەرگیریی

ژیانیان وەك سەربازیی لێدێ و بە قاڵبێکی قورسەوە ژیان دەگوزەرێنن. پێویستە پیاو دوای هاوسەرگیریی بزانێ، بەرپرسیارییەتی خۆت و خێزانت لەسەر تۆیە، دەبێ زۆر خووی تەمەنی گەنجییت، لەگەڵ خێزان و ژیانی ئێستاتدا، بگونجێنی نەك بەپێچەوانەوە. خۆت لە بەرپرسیاریەتیی مەدزەوە، ڕاکردن لە بەرپرسیارییەتی تەنها ئەرکت قورستر دەکات و ڕێی گەڕانەوەت دوورتر دەکات، خۆتمەگنخێنە لە ئیشی نێوماڵ، وەك چۆن پێش هاوسەرگیریی چەندان بەڵێنت بە خێزانت داوە تا ڕازی ببێ، ئێستاش دەبێ کردەوەکانت لە جیاتی خۆت قسە بکەن و، لێمەگەڕێ کێشە کاتییەکان زنجیرت بکەن. با نزیکترین هاوڕێت خێزانەکەت بێ و گرنگی پێبدە، بێدەنگیی بەرزترین دەنگە و، ئافرەت بە پشتگوێخران قەڵس دەبێ، ناحەقیان نییە کاتێك تۆ هەموو ژیانی ئەوی، گاڵتەی لەگەڵ بکە و گاڵتەی پێمەکە، نازی بکێشە و خۆشەویستیی پێشان بدە، ئەگەرنا چۆن بزانێ هێشتا تۆ خۆشتدەوێ؟ بەڵام زۆر گرنگە بەردەوام ڕێز و متمانە لە بەینتاندا زیندوو بێ. حەقی خێزانەکەت بدە، وانەبێ بەس بیرت لای حەز و ئارەزووی خۆت بێ، پێت

وانەبێ حەزی نییە، بەس لەبەر ئەوەی شەرم دەكات و بێدەنگە.

ئافرەتیش دەبێ وریابێ لە هەڵبژاردنی هاوسەری، ئەمە ژیانی ڕاستییە، نەك ڕۆمانی فەڕەنسیی و فیلمی توورکیی، دەستبارگربن بۆ پیاوەکانتان و تا بکرێ بە نەرمیی شتیان پێ بڵێن، چونکە پیاو لەگەڵ خێزانەکەی بە هەستی بەزەیی و نەرموونیانیی ئاسانتر دەجووڵێ، نەوەك بە چەندبارەکردنەوە و تووڕەبوون. دڵنیابن بەشێك لە پیاوان لە ئاست پێشبینیی ئێوەدا نابن، لە ڕووی خۆشەویستیی و مامەڵەکردنەوە، بۆیە خۆتان سەغڵەت مەکەن و پشوودرێژبن، هیچ کەسێك فریشتە نییە و، هەموو مرۆڤێك توانای گۆڕانی هەیە، ئەگەر هاوکاری هەبێ، پێتان وانەبێ ژیانی هاوسەرگیریی بەبێ خۆماندووکردن وەك داستانی (ڕۆمیۆ و جولیەت) دەبێ - کاتێك چاوەڕوانیی زۆرمان لە کەسێك هەیە، مێشمان لێ دەبێ بە گامێش. هەرچەند ئەگەر حەقیش لە لای تۆبێ، ڕێگایەکی گونجاو بدۆزەوە بۆ گەیاندنی گلەییەکانت، زۆر لەبن گوێی پیاوان مەخوێنن، دووربینانە مامەڵە بکەن و دڵنیابن، بابەتی زۆر گچکە کێشەی زۆر گەورە دروست دەکات. بزانن کێشەو لێکتێنەگەیشتنتان دەبێ، هاوڕێی یەکتربن؛ دانیشن و قسە بکەن، خێرا خەڵك

تێمەگەیەنن چونکە ڕێز و متمانە لە نێوانتاندا زۆر کەم دەکات، ئەگەر نەگەیشتنە ئەنجام یەکدووکەسی لێزان و دڵسۆز ئاگادار بکەنەوە و، لە باسکردنی کێشەکانتان بە ویژدان بن، هەوڵی چاککردن بدەن، نەك تۆڵە کردنەوە و ڕق پێکرشتن.

هاوسەرگیریی و خۆشەویستیی، پێویستی بە بارقووڵیی و سنگفراوانیی و لێزانین و کات بۆ تەرخانکردنە، هیچ شتێك لە شوێنی خۆی ناوەستێ، کاتێك شتێك زیادی نەکرد، دیارە کەم دەکات، تا دەتوانن پەیوەندیتان لەگەڵ خوا چاك بکەن، چونکە دوورکەوتنەوە لە خوا، سەرەتای هەموو کێشەیەکە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (ئەوەی پشت لە یادی ئێمە بکات، ژیانێکی تەنگ و تاریك و نارەحەتی دەبێ و، لە قیامەتیش بە کوێریی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکەین).

سەبارەت بە هاوڕێیەتی پێش هاوسەرگیرییش، پێم وایە ئافرەت و پیاو قەت ناتوانن ببن بە هاوڕێ، وەك چۆن دوو پیاو، یان دوو ئافرەت دەبن بە هاوڕێ، چونکە هەردوو ڕەگەز خاوەنی چەندان جیاوازیی جەستەیی و فیکریی و حەز و ئارەزوون، درەنگ یان زوو ئەو هاوڕێیەتییە سەردەکێشێ بۆ شتی دیکە. زۆرێك لە خەڵکی

هاوڕێیەتیی و خۆشەویستیی بەکاردێنن بۆ زووتر و ئاسانتر بە حەڕامیی گەیشتن بە جەستەی بەرامبەر، کە زۆر جار کارەساتی گەورەی لێدەکەوێتەوە و لایەنێکیان دەبێ بە سووتەمەنیی دڵخۆشبوونی ئەوی دیکە، پیاو دەبێ هاوڕێیەتیی پیاوان بکا و ئافرەتیش هاوڕێیەتیی ئافرەتان، ئەوە حاڵەتی سروشتیی هاوڕێیەتییە. ئەو سنوورشکاندنە کاریگەریی خراپ لەسەر ژیانی هەردوولا بۆ ئێستا و داهاتوو بەجێدێڵێ.

بابە گیان! پێم خۆشە بۆم باس بکەی ئافرەت و پیاو تا کوێ بۆیان هەیە لە یەکتری نزیك بن؟ بۆچوونت چییە دەربارەی خۆشەویستیی و هاوڕێیەتی پێش هاوسەرگیریی؟

بــابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله، وصلى الله تعالى وسلم وبارک على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه

کاك شەریف گیان!

لەبارەی پرسیارەکەتەوە، دەڵێم:

**یەکەم:** دیارە خوا (سبحانه وتعالى) کە بەشەری دروستکردووە، بەشەری بە جووت دروست کردووە، واتە: ئادەم و حەوا (سەلامی خوایان لێبێت)، دایك و بابی مرۆڤایەتیین، یەکیان نێر بووە و ئەوی دیکە مێ بووە، بەردەوام بوونی بەشەر لەسەر زەوی بەستراوەتەوە بەو دووانەوە، بە هەردووکیان، واتە: لە هەردووکیان مرۆڤ پەیدا دەبێ و بە هەردووکیان دەگونجێ وەچەی بەشەر لەسەر زەوی بەردەوامبێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗاۖ يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى.

واتە: [خوا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، لە خۆتان و لە ئاژەڵەکان جووتی دروستکردوون (هاوسەری دروستکردن دوو دوو) کە بەهۆی ئەوەوە زۆرتان دەکات، یاخود دروستتان دەکات و، وەچەتان لێ وەپاش دەخا].

**دووەم:** بەڵام پەیوەندیی نێوان پیاو و ئافرەت، یان نێرو مێ، ئەگەر بێت و پەیوەندییەکی تەندروست نەبێت و لەسەر بناغەیەکی ڕێك و ڕوونی شەرعیی نەبێت، بێگومان بۆ هەردووکیان بە زییان دەشکێتەوە و، بۆ ئەو وەچەیەش کە لێیان پەیدا دەبێت و، بۆ ئەو کۆمەڵگایەش کە تێیدا دەژین، هەر بۆیە ئیسلام زۆر گرنگی بەوە داوە کە دەبێت ئافرەت و پیاو لەسەر بناغەی گرێبەستێکی ڕوون و پێزانراو (ئاشکراکراو) بەیەك بگەن، ئەگەر بیانەوێ ژیانی هاوسەریی پێکبهێنن، واتە: هەم دەبێ گرێبەست (عقد) پێکبهێنرێت، وەك هەموو ئەو گرێبەستانە، دەبێ بە ئامادەبوونی شاهیدان بێت و، دەبێ بە ئاشکرابێت و، بە ڕوونیی و بە پێخۆشبوونی هەردووکلا بێت، نەك بە ئارەزووی لایەك و ناچارکرانی لایەك، یاخوود هەردوولا ناچار بکرێن.

**سێیەم:** بێگومان پیاو کە هاوسەرگیریی دەکات و، ئافرەت کە هاوسەرگیریی دەکات، بە تەئکید ئەگەر یەکدییان بەدڵ نەبێت و خۆشەویستییان بۆ یەکدی نەبێت، دیارە نایکەن، ئەوە

بێگومـان وایە، بـۆیە ئەوە شـتێکی ئاسـاییە پیاوێـك، کوڕێـك، بەتایبەتی پیاو زیاتر دەستپێشخەریی دەکات، بەتەمایە ئافرەتێك ببینێت، حەتمەن دەبێت دڵی پێوەبێت، بەڵام تا چ ڕاددەیەك دروستە ئەو ڕەفـاقەت و پێکەوەبـوون و هـاوەڵایەتییە؟! لەڕاسـتییدا ئەوەی کە لە ڕۆژئـاوا هەیە، لە ئەورووپـا و ئەمریکـا و ئەوانەدا هەیە، هەمووی لادانە لە عەقڵ و لە زگماك. چونکە بۆخۆت دەزانـی لەوێ جاری وا هەیە ئەو کوڕ و کـچە پێکدەگەن بە ناشـەرعیی و منداڵیشـیان دەبێـت کە جـاریێ ئێسـتا مـارە نەکـراون! ئەوەش هەمـووی لادانە لە زگمـاك و لە عەقـڵ و لەشـەرع و لە هەمـوو شـتێك. بـۆیە لە ئیسـلامدا ڕێگـا دراوە کە پیـاو ئەو ئـافرەتە ببینێـت و، ئەو ئـافرەتە ئەو پیـاوە ببینێـت و، پێغەمـبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمـوویەتی: {فَـانْظُرْ إِلَيْهَـا} واتە: [تەماشـای بکە]، لەو بارەوە با سەیری ئەم گێڕانەوەیە بکەین:

{ عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ خَطَبْتُ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا؟ قُلْتُ لَا، قَالَ: فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا}[١]

---

١) أخرجـه أحمـد بـرقم (١٨١٦٢)، وابـن ماجـه بـرقم (١٨٦٦)، والـدارقطني (٣/٢٥٢)، والطبراني برقم (١٠٥٢)، والبيهقي بـرقم (١٣٢٦٧). وأخرجـه أيضًا: الترمذي برقم (١٠٨٧) وقال: حسن. والنسائي برقم (٣٢٣٥).

واتە: [موغیرەی کوڕی شوعبە گوتوویەتی: لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئافرەتێکم خواستبوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: بینیوتە؟ گوتم: نەخێر، فەرمووی: تەماشای بکە، ئەوە باشترە کە دوایی ژیانتان پێکەوە بەردەوامبێت، (واتە: دەبینی بەدڵت نابێ)].

جا ئەوە بۆ پیاویش وایە و بۆ ئافرەتیش وایە، بایی ئەوەندە کە یەکدی بناسن و، بزانن داخۆ کە یەکدییان بەدڵە، یان نا؟ لە ڕووی سروشت و تەبیعەتەوە، لە ڕووی ئەخلاقەوە، لە ڕووی قەد و قیافەوە، دروستە، پێك ئاشنابن.

بەڵام لەوە بەولا، حەدیسی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ: {يَخْلُوَنَّ أَحَدَكُم بِامْرَأَةٍ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ}[1] واتە: [یەکێك لە ئێوە با لەگەڵ ئافرەتێك پێکەوە لە شوێنێکی چۆڵ نەبن، مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت].

حەدیسێکی دیکەش هەیە دەفەرموویت: {ما خَلا رجلٌ بامرأةٍ إلَّا كان الشَّيطانُ ثالثَهما}[2] [هیچ پیاوێك بە تەنێ لەگەڵ

---

١) أخرجه أحمد برقم (١١٤) قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين.

٢) أخرجه الطبراني برقم (٧٨٣٠). قال المنذري (٢٦/٣): غريب. وقال الهيثمي (٣٢٦/٤): فيه علي بن يزيد الألهاني وهو ضعيف جدًّا وفيه توثيق.
ئەمەش دەقەکەیەتی: {إياك والخلوة بالنساء، والذي نفسي بيده ما خلا رجل بامرأة إلاّ دخل الشيطان}.

ئافرەتێك لە شوێنێكی چۆڵ نەبووە، مەگەر سێیەمیان شەیتان بووە].

ئیسلام زۆر پەرژینی داناون، چونكە هەرچی گوناح و تاوان لەوەوە دەست پێدەكات، كە پیاوێك و ئافرەتێك پێكەوە لە شوێنی چۆڵ دەبن و، كەس چاوی لێ نابێ، بۆیە شەریعەت دایناوە، ئەو كاتەی پیاو دەیەوێ ئەو ئافرەتە ببینێ، یان دەبێ لە شوێنێكی قەڵەباڵغ بێ یان دەبێ لەگەڵ مەحرەمێكی خۆیدابێت، ئەگەرنا دروست نییە بە تەنێ پیاسە بكەن و یەكدی خۆشویستنیش ئەوە دیارە شتێكی سروشتییە، وەك گوتم، پیاو ئەگەر دڵی بەو ئافرەتەوە نەبێت و، ئەو ئافرەتە دڵی بەو پیاوەوە نەبێت، دوایی چۆن دەبنە هاوسەری یەكدی و، چۆن ژیان پێك دەهێنن، حەتمەن دەبێ بایی ئەوەندە بەیەكدی ئاشنابوون هەبێت، بەس بۆ زانیاریشت! كاتی خۆی لە كوردەواریی خۆماندا وابووە، كابرا ژنی بۆ كوڕەكەی هێناوە، یان كچەكەی بە مێرد داوە، بەبێ ئەوەی یەكدی خۆشویستن و شتیش بووبێ، تەماشاش دەكەی ژیانێكی زۆر تەندروستیشیان بووە، هەشە بە دڵی خۆیشی دەیهێنێت، بەڵام دوایی ژیانێكی زۆر پڕ گێرە و كێشە و چەرمەسەرییشی دەبێ. بە حەقیقەت پابەندیی بە سنوورەكانی شەریعەتەوە، بە ئەخلاقە ئیسلامییەكانەوە، دوای ئەوەی ئەو پیاو و ئافرەتە دەبنە قیسمەتی یەكدی، پاراستنی ئەدەبەكانی شەرع

و پاراستنی مافەکانی یەکدی، ڕێز لە یەکدی گرتن و، ڕەچاوی مافی یەکدی کردن زۆر کاریگەریی هەیە لەسەر ئەوە کە بتوانن ژیانێکی تەندروست و ڕێکیان هەبێ و، لە تەنگ و چەڵەمە و کێشە دووربن.

من وەك کوڕێکی خۆشەویستی خۆم ئامۆژگاریی تۆ دەکەم: کە ئافرەت، مایەی تاقیکردنەوەیەکی سەختە بۆ پیاو، حەدیسی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێ:

{مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنْ النِّسَاءِ}[1]

واتە: [لە دوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەیەکم سەختتر بەجێ نەهێشتووە، لە ئافرەتان بۆ پیاوان].

پیاو بە ئافرەت تاقی دەکرێتەوە، دیارە ئافرەتیش هەروا، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاو زیاتر دەسپێشخەر دەبێت بۆ هاوسەرگیریی کردن، ئافرەت زیاتر حاڵەتی چاوەڕوانیی کردنی هەیە، پیاو حاڵەتی دەسپێشخەریی هەیە، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئاوا دەفەرمووێت.

ئنجا تۆ لەوبارەوە دەبێت تا بۆت دەکرێت، وریابی، زۆر جار ئافرەتێك دەسپێشخەریش دەکات بۆ لای پیاو، بەڵام مەرج نییە وەك پێویست بێ، دەبێ ئینسان وریابێ عاتیفییانە بیر نەکاتەوە،

---

١) أخرجه البخاري برقم (٤٨٠٨)، ومسلم برقم (٢٧٤٠).

دوایــی تووشــی بڕیــارێکی هەڵە ببــێ، ئەو مەســەلەیەش وەك بڕیارێکی جوزئیی نییە، وەك ژەمە خواردنێك یاخود کراسێکی لەبەر دەکەی، یاخود سەفەرێك دەکەی، یان شتێك دەکڕی، دوایی بە کەڵك نەهات، وازی لێ دێنی! هاوسەرگیریی هەڵە پێی دەگوترێت: هەڵەی تەمەن (غلطة العمر) بە تایبەتی بە نسبەت ئافرەتەوە، بە نسبەت پیاویشەوە هەر وایە، جاری وا هەیە پیاوێك هاوسەرگیریت لەگەڵ ئافرەتێك دەکات، دوایی هەتا دەمرێت، بەدەستیەوە دەناڵێنێت و گرفتار دەبێت بەدەستیەوە، بۆیە ئینسان دەبێت زۆر بیربکاتەوە، هەر بۆیەش لە شەریعەتدا فەرمان کراوە بە هەم پیاو و، هەم بەئافرەت، کە بە ڕاوێژ و بە ئیستیخارە و بە بەرچاو ڕوونییەوە، بۆ ئەو پڕۆسەیە هەنگاو بنێن.

والسلام عليكم ورحمة الله.




## خۆشەویستیی نێوان ئافرەت و پیاو

شەریف: لە تەوەری پێشوودا باسی ئەوەمان کرد لە چوارچێوەی شەرعدا ئافرەت و پیاو تا کوێ بۆیان هەیە لێك نزیك ببنەوە و، باسی هاوسەرگیریی و حاڵەتی پێش هاوسەرگیریمان کرد، خەڵکانێك لەم سەردەمەدا، ئەو خۆشەویستییەی دەبێ دوای هاوسەرگیریی لە دایك بێ، زۆر جار لەلایان پێش هاوسەرگیریی دێتە ژیان و دەشمرێ، دەبینی چەند ساڵێك خۆشەویستیی دەکەن، بە بیانووی ئەوەی دەیانەوێ جارێ یەکتر بناسن، کە هاوسەرگیریی دەکەن هیچ خۆشەویستیی و ڕێزێك لە نێوانیاندا نەماوە. وەك چۆن شیفا و دەرمان لە هیچ شتێکی پیسدا نییە، بۆیە حەرامە، خۆشەویستییەکیش بە حەرامیی دروست ببێ، هیچ شتێکی خێری لێ پەیدا نابێ، چونکە ئەسڵەکەی هەڵەیە، وەك ئەوەی یەکێك

بیهەوێ بینایەك لەسەر بناغەیەكی خوار دروستبكات! هەرچەند خۆی ماندوو بكات، مادام بناغەكەی فشۆڵ و خوارە، ڕۆژێك دێ لێی تێك دەچێ. خاڵێكی دیكە ئەوەیە، مرۆڤ كاتێك شتێكی باش دەكات، دڵی پێی خۆش دەبێ، ئەگەر شتێكی خراپیش بكات دڵی دەگوشرێ و تووشی دڵەڕاوكێ دەبێ. كاتێك كەسێك خۆشەویستییەكی حەڕام دەكات، بەردەوام دڵی لە دەستی دایە و لە دوودڵیی و ترسدا دەژی، نەوەك ئاشكرا بێ یان كەسی بەرامبەر دڵی بگۆڕێ، ئەو جۆرە كەسانە قەت ناكرێ بەراورد بكرێن بە كەسانێك كە بەڕێز و قەدرەوە هاوسەری خۆیان خۆشدەوێ و، لەسەر خۆشویستن و باشبوونیان لەگەڵ هاوسەرەكانیان، پاداشتیش وەردەگرن و بۆیان بەخێر دەنووسرێ.

بابە گیان! دەبێ خۆشەویستیی نێوان پیاو و ئافرەت چۆن و كەی بێ؟

بـابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

خــوای پەروەردگــار لە بــارەی پەیوەنــدیی نێــوان پیــاو و ئـافرەتەوە، لە قورئـانـدا لە ئـایەتی (٢١)ی سـوورەتی (الـروم)دا دەفەرمووێ:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم.

واتە: [لە نیشـانەکانی پەروەردگـارییەتی خـوا، ئەوەیە کە لە خۆتـان هاوسـەرانتانی بـۆ هێنـاونە دی (واتە هەر لە سروشـتی خۆتـان) تـاکو بەهۆیـانەوە سـرەوتن و ئارامییتـان بـۆ بـێ و، خۆشەویستیی و بەزەیی لە نێوانتان داناوە، لەوەدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە].

کەواتە: پەیوەنـدیی ڕاسـت و دروسـتی نێـوان پیـاو و ئـافرەت ئەوەیە کە بەزەیـی و خۆشەویسـتیی و ئـۆقرە بە یەکـدی گـرتن بێ، ئەوە ئەسڵ و بناغەکەیەتی. هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لە ژن و مێردە، ئەوانەی کە دەبنە هاوسـەر. ئنجـا ئایـا ئەوە لە کەیەوە

دەستپێبکرێ و چۆن بێ؟ بێگومان هەر پیاوێك كە دەیەوێ ژن بێنێ، یان ئەو ئافرەتەی دەیەوێ شوو بكات، دیارە چاو و دڵ بۆ كەسێك دەگێڕێ كە پەسەندی بێ و پێی چاك بێ، بە دڵی بێ، لە ڕووی جەستەوە، لە ڕووی ناخەوە، لە ڕووی ڕەوشتەوە، لە ڕووی ئاكارەوە.

یەكێك لە هاوەڵان ژنی خواستبوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: [تەماشات كرد؟ گوتی نەخێر. فەرمووی تەماشای بكە [فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا][(١)] واتە: تەماشای بكە (واتە یەكدی ببینن و پێك ئاشنا بن) چونكە ئەوە شایستەترە تاكو پەیوەندییتان باش بێ].

ئنجا بە ئەندازەی ئەوە كە مرۆڤ بە بەرامبەرەكەی ئاشنا دەبێ، جا چ لە ڕووی جەستەییەوە، لە ڕووی سلووك و ڕەوشتەوە، لە ڕووی ناخیەوە، لە ڕووی پاشخانی فیكرییەوە، بایی ئەوەندەی دروستە چ بۆ پیاو چ بۆ ئافرەت، كە پێك ئاشنا بن. بەڵام بێگومان سنووری پێ ئاشنا بوون بەولاوە، هەر جۆرە مامەڵەیەكی دیكە، بەدڵنیاییەوە، قەدەغەیە، ئنجا دوای ئەوەی كە پێك ئاشنا دەبن، هەڵبەتە پیاو زیاتر داوای دەستی ئافرەت دەكات، پیاو داواكارە و ئافرەت زیاتر داواكراوە. دەبێ ئەوكات ئەو پیاوە ئاشنا بووبێ بەو ئافرەتەی دەیهەوێ بیكات بە

---

١) پێشتر تەخریج كراوە.

هاوبەشی ژیانی و دایکی منداڵانی و دەیکاتە هاوسەری، ئەو ئافرەتەش بەهەمان شێوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەو بارەوە دەفەرمووێ:

{تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ}(١) واتە: [ئافرەت یان لەبەر دینی، یان لەبەر ماڵ و سامانی، یان لەبەر جوانیی، یان لەبەر ڕەچەڵەكی دەخوازرێ. تۆ چاو بۆ خاوەن دینەكە بگێڕە، ئەگەر وانەكەی لەبەر فەقیریی بە زەوییەوە بنوسێی].

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێنمایی دەكات كە تۆ لە پێشتریی بدەی بە دینداریی. بەڵام مانای واش نییە كە بەدڵت نەبێ لە ڕووی جەستە و هەڵسوكەوت و ئەوانەشەوە، ئەوە بەنسبەت پیاوەوە كە بەدوای ئافرەتدا دەگەڕێ، تاكو هاوسەرگیری لەگەڵدا بكات.

بەنسبەت ئافرەتیشەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: {إِذَا جاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ، فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا، تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ}(٢) واتە: [ئەگەر كەسێك هات

---

١) أخرجه البخاري برقم (٤٨٠٢)، ومسلم برقم (١٤٦٦).

٢) أخرجه الترمذي برقم (١٠٨٤) وقال: هذا الحديث قد خولف عبد الحميد بن سليمان في هذا الحديث ورواه الليث بن سعد عن ابن عجلان عن أبي هريرة

بۆ لاتان، داوای خزمایەتیی لێکردن، داوای ئافرەتی لێکردن، لە دینداریی و ئەخلاقی ڕازی بوون، هاوسەگیریی لەگەڵ بکەن، پێی بدەن، ئەگەرنا ئاشووب و بەڵایەکی فراوان لە زەویدا دەبێ].

بێگومان وایە، هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ئافرەت، دەبێ تەماشای دین و ئەخلاق بکات. دین پەیوەندییە لەگەڵ خوادا، ئەخلاق پەیوەندییە لەگەڵ خەڵقی خوادا. لە دوای ئەوەوە ئەوجار خۆشەویستیی ڕاستەقینە لە نێوان ئەو دوو هاوسەرەدا پەیدا دەبێ، واتە پێش ئەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی ئەنجام بدرێ، تەنیا بایی ئەوەندە پێك ئاشنا بن و لێك شارەزا و حاڵیی بن، بزانن جەستە و حاڵەتی دەروون و ئاکاری یەکدی چۆنە، بایی ئەوەندە بۆی هەیە زانیاریی لەسەری هەبێ، یاخود پێی ئاشنا بێ. لەوە بەولاوە دروست نییە. ئەوە کورتەیەك بوو لەسەر ئەو باسە، ئەگەر پرسیارێکی دیکەت هەیە، دەتوانی بیکەی.

---

عن النبي (مرسلاً، قال الترمذي: قال محمد: وحديث الليث أشبه ولم يعد حديث عبد الحميد محفوظاً. وابن ماجه برقم (١٩٦٧)، والحاكم برقم (٢٦٩٥) وقال: صحيح الإسناد. وتعقبه الذهبي بأن فيه عبد الحميد بن سليمان أخا فليح، قال أبو داود: كان غير ثقة، ووثيمة لا يعرف. وأخرجه أيضًا: الطبراني في الأوسط برقم (٤٤٦).

شەریف: دەستت خۆش بێ بابە گیان، زۆر سوپاس.
هەندێ خەڵك ئەوە دەكەن بە بیانوو كە چەند مانگێك قسە بكەن، تا یەكتر بناسن و پێك ئاشنا بن، بزانن بەیەكەوە دەگونجێن یان نا؟ جا ئەو چەند مانگەی بۆ یەكترناسین دایدەنێن، زۆرجار دەبێت بە چەند ساڵێك، هەندێ جار دوای ئەو چەند ساڵەش، هەر بۆ یەكتریش نابن و زۆر جار شتی حەڕامیش دەكەوێتە بەینیان و دەبێتە هۆكاری دروستبوونی كارەسات و كێشە، ئایا ئیسلام هیچ مەوداو و سنوورێكی كاتیی داناوە بۆ ئەو یەكترناسینی پێش هاوسەرگیریی؟

بابم: بۆ قسەكردنیان دەبێ مەحرەمێكیان لەگەڵ بێ، دەبێ بە ئەدەبی شەرعیی بێ، بۆیان هەیە پرسیار لە یەكدی بكەن و قسە بكەن. بەڵام بڵێی بۆ چەند مانگ و چەند ساڵ، ئەوە دروست نییە و هیچ نییە، بەس نەریتی نەفامییە، ئنجا دواییش ئەوە چبوو؟ ئەوە بەدڵم نەبوو! بێگومان هەردووكیان پێی دەشكێن و ڕەوا نییە. ئەوەی دروستە هەر ئەوەیە كە مەحرەمێكیان لەگەڵ بێ و قسەی ئاسایی بكەن، بۆیان هەیە یەكتر ببینن، بەڵام ئەوە كە بە تەنێ بیبینێ، یان پیاسەی لەگەڵ بكات و بچنە دەرێ، ئەوە هەمووی ناشەرعییە و

هەمیشـەش هەڵسـوكەوتی هەڵە و ناشـەرعیی، دەرەنجـامی وەك خۆیشی بەدوای خۆیدا دێنێ.

شـەریف: ئەدی ئەگەر مەحرەمێكیان لەگەڵ نەبێ، بەڵام بچن بۆ شوێنێكی كراوە كە خەڵكی لێبێ؟

بـابــم: باش نییە، بەڵام مـادام حاڵەتی خەڵوە نەبێ، واتە: بەتەنێ نەبن، مەجالێكی تێدا هەیە، بەڵام باش نییە، چونكە لەبەر سـومعەی ئـافرەتەكە و دەبینـی بـۆ یەك نـابن، یـان نـاگونجێن، بینرانی لەگەڵ پیاوێكی نامەحرەمدا قیل و قالی لەسەر دروست دەكات.




# حیکمەتی ناڕەحەتیی و ناخۆشییەکان و مامەڵەیەکی دروست

شەریف: دەگونجێ یەکێك بپرسێ: بۆچی ناڕەحەتیی و ناخۆشیی هەیە لە ژیاندا؟ خۆ دەکرا ژیان وەك بەهەشت بووبا؟ هیچ شتێك لەم گەردوونەدا بەبێ ئامانج و حیکمەت نییە. زۆرجار دوای تێپەڕبوونی ڕووداوەکان حیکمەت و ئامانجەکەمان بۆ دەردەکەوێ. لە ڕاستییدا ناخۆشیەکانن خۆشییەکان جوان دەکەن، سەختییەکانن، سەرکەوتن لەلای کەسانی ئازا شیرین دەکەن، وەك چۆن ئەگەر تاریکیی نەبووبا، کەس نەیدەزانی ڕووناکیی چییە؟ ئێمە بەهۆی ناخۆشیی و ناڕەحەتییەوەیە دەزانین خۆشیی و سەرکەوتن چییە! نموونەیەکی ئیمام غەززالییم بیرکەوتەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێ: "ژیان وەك دوورگەیەك وایە، دانیشتوانانی زەوی لە کەشتییەك

دان و بەلای دوورگەکەدا تێدەپەڕن و تاوێك لادەدەن. خاوەن کەشتی فەرمان دەکات کەم دەمێننەوە و دەبێ زوو بڕۆن، درەنگ مەکەون. کۆمەڵەی یەکەم خێرا دەگەڕێنەوە نێو کەشتییەکە، چونکە دەزانن شتی بەنرختر و گرنگتریان لەپێشە، ئەوانە ئیماندارانن و خۆشیی و جوانیی کەمی ئەو دوورگەیە دوای نەخستن. کۆمەڵەی دووەم دڵیان بە دوورگەکەدا چوو، بەڵام بە پەلەپرووسکە دەگەنەوە کەشتییەکە و بەجێنامێنن، ئەوانەش ئەو کەسانەن حەقیقەتی ژیان و قیامەت دەزانن، بەڵام لە کردەوەکانیاندا کرچوکاڵن، کۆمەڵەی سێیەم کەسانی بێبڕوان، ئەوانەن لەبەر کەمێك جوانیی و خۆشیی دوورگەکە، فەرمانی خاوەن کەشتییەکەیان شکاند و زۆر شتی باش و خۆشیان لە دەست خۆیاندا". مەبەستم ئەوەیە کاتێك مرۆڤ ژیان وەك ئەو دوورگەیە دەبینێ و، مردنیش وەك ئەو کەشتییە و هۆکارێك بۆ گەیشتن بەهەشت و خۆشییە نەبڕاوەکان، دەزانێت ژیان و ئەوەی تێیدایە بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤە و نارەحەتییەکانی ژیان زۆر کاری تێناکەن و، بەردەوام بە ڕووحێکی پۆڵاییەنەوە بەرەنگاری ژیان دەبێتەوە. لە بابم بپرسی:

بابە گیان! حیکمەتی کێشەو گرفت چییە لە ژیاندا؟ چۆن مامەڵەیەکی تەندروستیان لەگەڵدا بکرێ؟

بـابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

ئەمشــەو بــۆت باســی ئەوە دەکەم کە لە ژیانــدا، مرۆڤــی مسوڵمان یان نامسوڵمان لە گرفت و کێشە خاڵیی نابێت. بۆت باســی حیکمەتــی گرفــت و کێشــە دەکەم لە ژیــانی مرۆڤــدا، مرۆڤی مسوڵمان دەبێ چۆن لەگەڵ ئەو گرفت و کێشانەی کە دێنە ڕێی ڕووبەڕوو ببێتەوە بۆ چارەسەریان. ئنجا لەوبارەوە با چەند ڕاستییەك بخەینەڕوو:

**ڕاســتیی یەکەم:** خــوا (سبحانه وتعالی) لە ســێ شــوێن لە قورئاندا ئەو باسەی ڕاگەیاندووە کە ئێمەی لەسەر زەوی داناوە بۆ تاقیکردنەوە:

**(١)** لە سووڕەتی (الکهف)دا دەفەرمووێ:

﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾﴾ الکهف.

واتە: [ئـێمە ئەوەی لە سـەر زەوی ڕازانـدوومانەتەوە تـاکو تاقیان بکەینەوە، بزانین کامیان کردەوەی باشترە].

**(٢)** لە سوورەتی (هود)دا دەفەرمووێ:

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ هود ٧.

واتە: [خـوا ئەو زاتەیە کە ئاسـمانەکان و زەوی بە شـەش قۆناغ هێناونە دی و عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە].

**(٣)** لە سوورەتی (الملک)دا دەفەرمووێ:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ الملك.

واتە: [خوا ئەو کەسەیە ژیان و مردنی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە].

کەواتە: لە کۆی ئەو سێ ئایەتە، سێ شتمان دەستگیر دەبن:

**یەکەم:** ژیانی مرۆڤ، ژیان و مردن بۆ تاقیکردنەوەن.

**دووەم:** سەر زەوی هەموو بۆ تاقیکرانەوەی مرۆڤ ڕاخراوە.

**سێ:** گەردوون هەمووی بۆ خزمەتی مرۆڤ دروستکراوە، چونکە لە ئایەتەکەی سوورەتی (هود)دا ئایەتی ژمار (٧) دەفەرمووێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ﴾ کەواتە: گەردوون هەمووی بەسەری و خواریەوە، بۆ تێدا تاقیکرانەوەی مرۆڤ هەڵخراون، سازکراون.

**ڕاستی دووەم:** با بزانین تاقیکردنەوەی مرۆڤ بەچی دەبێت؟ خوای بەرزی مەزن لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمووێت:

﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ ﴾ البقرة: ١٥٥.

واتە: [بە تەئکید تاقیتان دەکەینەوە بە شتێك لە ترس و بە برسێتیی].

﴿وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥﴾.

هەروەها بە کەمیی ماڵ و سامان و، کەمیی ڕووحەکان، (خزم و کەستان لە دەست دەدەن) و کەمیی بەروبومی میوەکان.

هەر لە سوورەتی (البقرة)دا لە ئایەتی (١٧٧)دا دەفەرمووێت:

﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِ ﴾ البقرة: ١٧٧.

واته: [ئەوانەی خـۆڕاگرن لە کـاتی هەژاریـی و، لە کـاتی نەخۆشیی و، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا].

لە کاتی ناخۆشیی و نەخۆشیی و لە کاتی ڕووبەرووبونەوەی سەختیدا یان دوژمـندا، کەواتە ئەوانە مـاددەی پێتاقیکراوەکـانن. جاری وا هەیە ئینسان لە زاتی خۆیدا تاقیدەکرێتەوە، جاری وایە هەیە بە دەورووبەری، جـاری واهەیە بە مـاڵ و سـامانی، جـاری وایە لە جەستەی دا، جاری وا لە نەفسیدا، جاری وا لە ئەوانەی کە لە دەوروبەرین.

**ڕاستیی سێیەم:** ئنجا مرۆڤ دەبێت چی بکـا بۆ ئەوەی لە تاقیکردنەوەکان دەرچێت؟ کە سەختییەکان بەجۆرێك بگـوزەرێنێ سەربەرزانە لێیان دەربچێت؟

**یەکەم:** ئەوە کە سروشتی ژیـانی دونیـا وەك خۆی بناسێت و بە شێوەیەکی خەیاڵیی تەماشای دونیا نەکات. پێی وابێت دونیا بەهەشتە و چاوەڕێ بێت کە لە دونیـادا بەردی سارد و گەرمـی نەیەتە بەر پێـی، چـونکە هەر کەسـێك پێشـبینی ناخۆشـیی و ناڕەحەتییـانی کـرد، کە کاتێـك ناخۆشـیی و ناڕەحەتییەکـان دەبینێت، لە بەرامبەریاندا خۆڕاگر دەبێت. بەڵام کەسێك وابزانێت هەمیشـە فەڕشـی سـووری بـۆ ڕاخـراوە و، ڕێـی بە گـوڵان بـۆ چێنـراوە و، هـیچ نـاڕەحەتییەکی نـایەتە بەرپـێ، بەردی سـارد و

گەرمی نایەتە بەر پێی، هەر کاتێ تووشی نارەحەتیی بوو دەخەجڵی !

**دووەم:** بزانێت کە هەرچی کە بەسەری دێت لەلای خوای پەروەردگارەوە، وەك ئەندازەگیریی، ئەندازەگیری کراوە و بە ویست و قەدەری خوا هیچ شتێکی بەسەر نایەت:

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴾ التوبة: ٥١.

واتە: [بڵێن هیچ شتێکمان بەسەر نایەت مەگەر خوا تۆماری کردبێت].

بەو واتایەی کە خوا تووشی نارەحەتییانت دەکات، نا، بەڵام خوا دەزانێ چیت بەسەردێ.

**سێیەم:** بۆ ئەوەی ئینسان لە تاقیکردنەوەکان دەربچێ، دەبێ دڵنیابێت کە زۆربەی موسیبەت و بەڵایەکان دەرەنجام و دەرهاویشتەی هەڵە و پەڵەکانی خۆینی، لە سووڕەتی (الشوری)دا خوا دەفەرموویێت:

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠ ﴾ الشوری.

واتە: [هەر بەڵایەکتان بەسەر دێ، کردەی دەستی خۆتانە و خوا زۆر جاریش دەبووریێت].

واتە: بەهۆی هەموو کەموکوڕییەکانتانەوە تووشی سەختیی و نارەحەتییانتان ناکات، هەروەها لە سوورەتی (العمران)دا خوا دەفەرمووێ:

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾ آل عمران.

واتە: [ئایا کە بەڵایەکتان بەسەر هات، کە ئێوە دووقاتی ئەوەتان تووشی بەرامبەرەکەتان کرد، گوتتان: ئەوە بۆچی؟ بڵێ: ئەوە خەتای خۆتانە].

هەروەها هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا خوا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْ﴾ آل عمران: ١٥٥.

واتە: [ئەوانەی کە لە ڕۆژی بەیەکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا پشتیان لە دوژمن کرد]. (هەندێك لە هاوەڵەکان خوا لێیان ڕازیبێت، شەیتان و نەفس زەفەری پێبردن و پشتیان لە دوژمن کرد لەو تەنگانەی جەنگی (ئوحودا) خوا دەفەرمووێت): [ئەوە شەیتان خلیسکاندنی بە هۆی هەندێك لە کردەوەکانیانەوە (بەهۆی هەندێك لە گوناحەکانیانەوە کە پێشتر کردبوویانن، شەیتان لەو کاتە ناسکەدا زەفەری پێبردن و

خلیسکاندنی و پشتیان لە دوژمن کرد) ئەوەش ڕاستییەکە، کە بزانی گرفت و کێشەکان دەرهاویشتەی هەڵە و پەڵەی خۆمانن.

**چوارەم:** تاکو ئینسان بتوانێت بەرەنگاریی گرفت و کێشەکان بکا و بەسەرییاندا زاڵبێت و لەبەریان چۆك دانەنێ و نەبەزێ، ئەوەیە کە بزانێت هیچ ناڕەحەتییەکی بەسەر نایەت مەگەر خوای پەروەردگار بۆی دەکاتە مایەی سڕانەوە لە گوناحەکانی و پاکبوونەوەی و، بۆی دەکاتە پاداشت، وەك لە سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرمووێ:

﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ التوبة.

واتە: [خەڵکی مەدینە و عەرەبە خێڵەکییەکانی دەورووبەری، بۆیان نییە کە لە پێغەمبەری خوا بەجێبمێنن لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەدا و، نابێ نەفسی خۆیان لەهی پێغەمبەر پێ لە پێشتر بێت، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە: تینوێتیی و ماندووێتیی و برسییەتییان لە ڕێی خوادا بەسەر نایەت و هیچ ئازارێکیان

تــووش نــایەت و، نــاچنە هــیچ شــوێنێك کافرەکــان ڕقیــان پــێ هەڵبستێت و هــیچ زەبرێك لە دوژمنــان نــادەن، مەگەر کــردەوەی باشــیان بەهــۆیەوە بــۆ دەنووســرێ، بە دڵنیــایی خــوا پاداشــتی چاکەکاران زایە ناکات].

دوای دەفەرمووێت:﴿ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ ... ﴿١٢١﴾ ﴾ التوبة، واتە: {هیچ ماڵ سەرف کردنێکی گچکە و گەورە ناکەن، هیچ دۆڵ و شیوێك نابڕن، مەگەر بە کردەوەی چاك بۆیان دەنووسرێت}.

کەواتە: ئەوەش شــتێکی زۆر گــرنگە کە ئینســان بزانێــت لە بەرامــــبەر نارەحەتییەکانــــدا پاداشـــت هەیە. مـــادام ئینســـان لەبەرامبەریانـدا خۆڕاگربێـت و، بەچـۆك دانەیەت و ناشـووکریی نەکات.

**پێــــنجەم:** ئەوەیە کە بزانێـــت کە بەهـــۆی ئەو گرفـــت و نارەحەتییانەوە مـرۆڤ پتەوتـر دەبێت، خـوای پەروەردگـار هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمووێ:

﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران.

واتە: [ئەو نارەحەتییانەتـان دێنێـتە ڕێ، بـۆ ئەوەی ئیمانـداران بپالێوێ، پاڵفتەیان کات].

چـــونکە ئینســـان لە کـــاتی نارەحەتییەکانـــدا هەســـت بە کەموکورییەکـانی خـۆی دەکـات، ئایـا سـەبری تـا چەنـدە، غیرەتـی تـا چەندە، سـەخاوەتی تـا چەندە، دان بەخۆداگرتنی تـا چەنـدە، یـانی: ئینسـان لە نارەحەتییانـدا خـۆی دەناسـێت. وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵـێ: "لە بوارێـدا لاقـی ڕەش و سـپی دەردەکەوێت". خەڵك کە لە کاتی پەڕینەوە لە ڕووباردا، دەگەنە بوار، لاقیان هەڵدەکەن، ئیدی دەزانرێ: کێ لاقی ڕەشەو کێ لاقی سپییە! یانی: لە تەنگانەدا ئینسان لە خۆی حاڵی دەبێ. ئنجـا ئەگەر ئینسـان ئەو پێـنج خـاڵە بێنێـتە بەرچـاوی خـۆی، هەموویـان دەبـنە هاوکـاری کە بەسـەر ئەو گرفـت و کێشـانەدا زاڵبێ. وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران)دا دیسان دەفەرمووێ:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ ﴾.

واتە: [زۆرێـك لە پێغەمـبەران هەبـوون (علیهم الصلاة والسلا ) کە سـانێکی ڕەببـانیی لە خزمەتیـان دابـوون، جەنگیـان لەگەڵ دوژمن کرد].

﴿فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾﴾ آل عمران.

واتە: [نەترسان لەسەر ئەوەی کە لە ڕێگای خوادا تووشیان بوو، نە بێهێزبوون و، نە خۆشیان بەدەستەوەدا، (زەبوونیی پێشان بدەن بەرامبەر بە دوژمن) و خواش خۆڕاگرانی خۆش دەوێت].

﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾.

واتە: [قسەشیان هەر ئەوەبوو کە گوتیان: پەروەردگارمان! لەگوناحەکانمان ببوورە].

﴿وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا﴾ .

واتە: [هەروەها لە زێدەڕۆیی کردنمان بمانبەخشە (بەهۆی گوناح و زێدەڕۆیی خۆمانەوە، دوژمن زەبرێکمان لێدەدات و بەسەرماندا زاڵ دەبێ)].

﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾ آل عمران.

پێیەکانیشمان بچەسپێنە و بەسەر دوژمنانماندا سەرمان بخە.

﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ آل عمران: ١٤٨.

واتە: [خوا پاداشتی دونیایی پێدان (کە سەرکەوتووبووین)].

﴿وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ آل عمران: ١٤٨.

هەروەها باشترین پاداشتی دواڕۆژیشی پێدان (کە گەیشتنە بە ڕەزامەندیی خوا و بەهەشتەکەی)].

ئنجا بێگومـان ئینسـان لە ژیـانی دونیـادا چ کـافر بێـت، چ موسڵمان بێ، بێ نارەحەتیی لێی ناگوزەرێت. خوا دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦﴾ الانشقاق.

واتە: [ئەی مرۆڤ تۆ ڕەنج دەدەی تا دەگەیە پەروەردگارت (یانی: کافر بێ یان مسوڵمان، هەر دەبێ ڕەنج بدات و ماندوو ببێ)].

هەروەهـا خـوا فەرمـوویەتی: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ٤﴾ البلـد، واتە: [ئینسـانمان لە ڕەنج و نارەحەتییـدا دروست کـردووە (هەموو مرۆڤێك ڕەنج و نارەحەتیی دەبینێ)].

ئنجـا ئەوەی کە لە ڕێـی خـوادا ڕەنج و نارەحەتییـان ببینـێ، پاداشتی هەیە و، ئەوەش کە لەڕێی خوادا نەبێت دونیاشی ڕەنج و نـارەحەتییە و، قیامەتیشـی هیچـی بـۆ حیسـاب نـاکرێ و لەسەریشـی تووشـی سـزا دێـت. چـونکە لە ڕێـیەکەوە ڕەنـج و نـارەحەتیی داوەتە بەر خـۆی، کە پەیوەنـدیی بە خـواوە نیـیە و لەبەر خـوا نەبـووە، هەم دونیایەکەشـی نـارەحەتیی دەبـێ و، هەم قیامەتەکەشی پاداشتی نابێت، ئەمە قسەی ئەم شەوم بوو.




## خۆڕاگریی لە تاقیکردنەوەکاندا

شـەریف: گەورەیـی مـرۆڤ بە ئەنـدازەی زۆریـی و کەمیـی نارەحەتییەکـانییەتی، ناخۆشـیی و نـارەحەتیی مـرۆڤ فێـری زۆر شـت دەکەن، وەك گـوتراوە: ئەو شـتەی نـاتکوژێ بەهێزتـرت دەکـات. سـەبارەت بە خۆڕاگریی و دانبەخـۆداگرتن لە کـاتی نارەحەتییـدا، هەر کەسـە پەنـا دەباتە بەر دەرچە و ئارامگەیەك، باشترینیشیان یادی خواو قورئـانە، وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، مـرۆڤ کە دروستکراوێکی خوای پەروەردگارە، تەنها بە نزیکیی لە خواوە، ئۆخژن و ئارامیی بۆ دێ. هەر ئۆخژن و چێژێك لە شتی ترەوە بـۆت بـێ، کـاتییە، زۆرجـار کـاریگەریی خـراپ لەدوای خۆشـی بەجێـدێڵێ. بـۆ وێـنە: کەسـێك تووشـی نـارەحەتییەك هـاتووە و، پەنـا دەباتە بەر دووکەڵ،

یـان شـتێکی پـیس، پێـی وایە بەوە بیـری دەچێـتەوە، بەڵام ئەوە نەك چارەسـەر نیـیە، بەڵکـو خـۆی ئـاڵوودەی شـتێکی زۆر پـیس دەکـات، کـە هەم زەرەری جەسـتەیی و مـاددیی هەیە، هەم زەرەری مەعنەویـــــی. لەم تەوەرەدا بــــاس لە خـۆڕاگریی دەکەیـن لە تـاقیکردنەوە و ناڕەحەتییەکانـدا، نەوەك خۆدزینەوە لە ژیان و حەقیقەتەکانی.

بـابە گیـان! پـێم خۆشـە باسـی ئەوەم بـۆ بـکەی لە ناڕەحەتیی و ناخۆشییەکاندا، پەنا بۆچی ببردرێ؟

بـابـم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کوڕی خۆم!

ئینسان کە تووشی گرفت و ناڕەحەتیی دەبێت باشترین ڕێی دەربـازبوون لـەم گرفـت و ناڕەحەتییـە، ئـەوەیـە کـە خـوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢﴾ الطلاق.

واتــە: [هەرکەسـێك پـارێز لــەخــوا بکــات، خــوا دەرووی لێدەکاتەوە].

لە شوێنێکی دیکەدا هەر لە سوورەتی (الطلاق)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤﴾.

واتە: [هەرکەس پارێز لە خوا بکات، خوا کاری بۆ ئاسان دەکات (لە کاروباریدا ئاسانیی بۆ دەڕەخسێنێت)].

ئنجا ئەمە شتێکی ئەزموون کراوە، ئەوە نییە بەس قسە بێت، ڕاستیی فەرمایشتی خوا، لە سەداسەدە و، شتێکی ئەزموون کراو و چەسپێندراوە.

[تەقواش بە سادەترین پێناسەی ئەوەیە وەك (ڕاغبی ئەسفەهانیی) دەڵێ: {وصار التقوى في اصطلاح الشرح حفظ النفس عما يؤثم}. واتە: [تەقوا لە زاراوەی شەرعدا: خۆپاراستنە لە هەر گوناحبار کارێك]. ئینسان بە دوو شتان گوناحبار دەبێت: قەدەغەکراوەکانی خوا بشکێنێت، یان واجبەکانی بچوێنێ].

کەواتە بەئەندازەی ئەوە کە ئینسان پابەند دەبێ بە شەریعەتەوە، ئەرکەکان جێبەجێ دەکات و خۆیشی لە قەدەغەکراوەکان دەپارێزێت، ئنجا بەئەندازەی ئەوەش خوای پەروەردگار دەرووی خێری لێدەکاتەوە و کاری بۆ ئاسان دەکات و دڵی فەڕاح دەکات. چونکە وەك چۆن خوا کۆمەڵێك یاسای گەردوونیی داناون، کە لە گەردیلەوە تا کەهکەشانەکان هەموویان بەو یاسا و بەو سیستمە خواییە بەڕێوە دەچن، لە

ژیانی بەشەریشدا کۆمەڵێك یاسای داناون، کە بەپێی ئەو یاسایانە ژیانی بەشەر بەڕێوە دەچێت، بۆیە خوای زانا لە قورئاندا زۆر باسی سوننەت دەکات و باسی (سنن) دەکات کە کۆی سوننەتە واتە: قانوون، دەفەرمووێ:

﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: [بێگومان ڕابورد لە پێش ئێوەدا چەند ڕێ و یاسایەك (باوێك) ئنجا ئێوە بگەڕێن بە زەویدا و سەرنج بدەن! ئایا چۆن سەرەنجامی بێ بڕوایەکان چۆن بوو. ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵك و ڕێنمایی و ئامۆژگارییە بۆ پارێزکاران].

کەواتە: ژیانی بەشەر گۆترەکاریی نییە و فەوزا نییە، بەڵکو خوا سیستمی داناوە: یەکێك لەیاساکان لە ژیانی بەشەردا، مرۆڤ چ وەك تاك یان وەك کۆمەڵ، خەڵکێك پەیامی خوا بەدرۆ دابنێن، خوا سزایان دەدات و بە پێچەوانەوە: هەر کەسێك پەیامی خوا لە باوەش بگرێت و، پارێز لە خوا بکات، خوای بەخشەر دەرووی خێری لێدەکاتەوە.

بۆنموونە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرمووێت:

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ الأعراف.

واتە: [ئەگەر دانیشتوانی شارەکان بڕوایان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە (لە قەدەغە کراوەکانی خوا) بەڕاستیی دەرگای بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە، بەڵام بڕوایان نەهێنا (بە پێغەمبەرەکەیان) ئنجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان، بەهۆی ئەو خراپانەوە کە دەیانکرد].

ئنجا لە ئەنجامی تەقواوە، پەیوەندیی ڕاست و دروستی لەگەڵ خوادا، کوڕم! ئینسان دڵی ئاسوودە دەبێت، تەماشا مووسا (علیه السلام) بکە! خوا دەینێرێت بۆ لای فیرعەون، لە سووڕەتی (طه) دەفەرمووێ:

﴿ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾﴾ طه.

واتە: [بڕۆن بۆ لای فیرعەون لەبەر ئەوەی سنووری بەزاندووە (لە کوفر و تاوان و سەرکەشییکردندا)].

مووسا چی گوت: ﴿قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَـٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾﴾ طه.

مووسا چوار داوا لە خوای پەروەردگاری دەكات: [پەروەردگارم! سینەم فراوان بكە و، كارم ئاسان بكە و گرێیەك لە زمانم بكەوە بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن، لە نزیكانی خۆیشم پاڵپشتێكم بۆ بڕەخسێنە، هاڕوونی برام، لە كاریشمدا بەشداریی بكە، بۆ ئەوەی زۆر بە پاكت بگرین و، زۆر یادت بكەین، بێگومان تۆ بینەری ئێمەی].

تەماشا دەكەی: لە ئەنجامی ئەو ئیمان و تەقوایەدا كە لە دڵی مووسادا جێگیر دەبێت، ئەو داوایانەی لە خوای پەروەردگاریان دەكات: سینەفراوانیی، كارئاسانیی، زمانكرانەوە و، هاوكار بۆ ڕەخساندن، دەستەبەردەبن.

وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ٣٦﴾ طه.

واتە: [فەرمووی: بەڕاستیی ئەوەی داوات كرد پێت درا ئەی مووسا].

ئنجا ئەوە بەس بۆ مووسا (علیه السلام) نییە، بۆ هەر كەسیكی دیكەشە، كە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە بڕوات و، بەئەندازەی خوا پێ مەبەست بوونی، خوا سەرپەرشتیی دەكات و لەگەڵی دەبێت، هەروەك گوتم، لە ئەنجامی پەیوەندیی لەگەڵ خوای بە بەزەییدا، ئینسان دڵیشی فەڕاح دەبێت، ئنجا هەر كەسێك دڵی فراوان بوو، كاریشی ئاسان دەبێت، چونكە بە

زۆریی ئینسان کە دڵی بچووك بوو، بە دوو خەمان دڵی پڕبوو، بە دوو گرفت سەری دونیای لێهاتەوە یەك، فیکریشی باش ئیش ناکات و کارەکانی لێدەئاڵقێن.

بەڵام لە ئەنجامی سینگ فراوان بووندا، ئینسان هاوسەنگیی تێکناچێ، وەك من هەمیشە دەڵێم "دڵی وەك ماڵە مێرووڵە نییە بە دڵۆپە ئاوێك وێران بێت". بەڵکو دامەزراو دەبێت و هاوسەنگیی تێکناچێ، لە ئەنجامی ئەوەشدا عەقڵیشی باشتر کار دەکات و دەستیشی باشتر هۆکارەکان دەگرێت. من پێم وایە ئەساسی دەروولێکرانەوە، وەك خوا فەرموویەتی: تەقوایە، چ بۆ تاك چ بۆ کۆمەڵگاکانیش.

ئەوەتا خوای زانا و توانا لە سوورەتی (الطلاق)دا، کە ڕەنگە زیاتر بۆ تاك بێت و دەفەرمووێت:

﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق.

واتە: [هەرکەس پارێز لە خوا بکات، خوا دەرووی خێری لێدەکاتەوە و بەبێ ئەوەی فیکریشی پێ بشکێ ڕزقی بۆ دەڕەخسێنێت].

ئەوە بەنسبەت تاکەوە، بەنسبەت کۆمەڵێشەوە (کۆمەڵگا) خوای تاك و پاك دەفەرمووێ:

﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٩٦﴾ الأعراف.

واتە: [ئەگەر دانیشتووانی شارەكان بڕوایان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە (لە قەدەغە كراوەكانی خوا) بەڕاستیی دەرگای بەرەكاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەكردنەوە، بەڵام بڕوایان نەهێنا (بە پێغەمبەرەكەیان) ئنجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان، بەهۆی ئەو خراپانەوە كە دەیانكردن].

تەقواش پلە پلەیە، بێگومان تەقوا بەپێی پابەندیی بە شەریعەتەوە، لە ژیانی تاكییدا، لە ژیانی خێزانییدا، لە هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتییدا، لە ڕووی ڕواڵەتەوە، لە ڕووی دەروونییەوە، ئینسان زیاتر چاودێریی خوای پەروەردگاری بەسەر خۆیەوە ببینێت و، ئەركە شەرعییەكان جێبەجێبكات، خۆی لە قەدەغەكراوەكان بپارێزێت، بەپەیژەی تەقوادا سەردەكەوێت. چونكە تەقوا یەك پلەی نییە، بەڵكو پلەی زۆرە هەر وەك ئیمانیش پلەی زۆرە و یەك پلە نییە، كەواتە: هەتا ئینسان بۆ خوا پارێزكارتر بێت، بە تەئكید خواش زیاتر سەرپەرشتیی دەكات و، ئاگای لێدەبێت و دەرووی خێری لێدەكاتەوە و دەستی دەگرێت، ئەم بابەتە دەتوانین زیاتریشی باس بكەین، بەڵام ئەوە كورتەیەك بوو دەربارەی پرسیارەكەت، كوڕی خۆم!




## گرنگیی دووعا و چۆنیەتیی کردنی

شـەریف: لە سروشـتی هەمـوو مرۆڤێـکدا حەقیقەتێـك چێنـدراوە ئەویـش ئەوەیە کە هێزێـك هەیە دەسـەڵاتی بەسـەر هەمـوو شتێکدا دەشکێ، هەموو شتێك دەتوانێ و دەزانێ، ئەویش خـوای باڵادەسـتە، هەر بـۆیە هەمـوو مرۆڤێـك لە کـاتی نـاڕەحەتیی و تەنگـانەدا، خێـرا سـەر بەرز دەکـاتەوە بەرە و ئاسمان و دووعـا دەکات. مـرۆڤ کاتێك بەو قەناعەت و بـڕوایەوە بـژی، دووعـا بـۆ هەمـوو شـتێك بکـات، زۆر ئاسـوودە و خـاترجەم دەبـێ، کاتێـك تووشـی نـاڕەحەتیی دەبێ، دەزانێ خوای پەروەردگـار ئاگـای لێیەتـی و داوای کارئاسانیی لە خوا دەکات، کاتێك شتی باش لە ژیانیدا ڕوودەدات، سوپاسـی خـوای پەروەردگـار دەکـات بـۆ بەردەوامبـوون و زیـادکردنی. تەماشـا زۆرێـك لە خەڵکـی

ئێستا بە ئینگلیزی پێیان دەگوترێ: (Attention Seeker) یانی: تینووی سەرنج و گرینگیپێدانی خەڵكین، خەڵك هەیە ئامادەیە هەموو شتێكی نامۆ بكات، شتی سەیر سەیر دەكەن، تەنها بۆ ئەوەی چەند كەسێك گرنگییان پێ بدەن، بەڵام بۆ؟ ئەو كەسانە ڕووحیان تینووە، مرۆڤی مسوڵمان هەرگیز تووشی ئەو تینوویەتییە نابێ، چونكە هەموو ڕاز و نیاز و خۆشیی و ناخۆشییەكی بۆ خوای پەروەدگار باس دەكات، بەردەوام هەست بە چاودێریی و بوونی خوای پەروەردگار دەكات لە ژیانیدا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ٤٥﴾. ئەوەی لێرەدا لە بابم دەپرسم:

بابە گیان! پێت باشە تا چەند دووعا بكرێ، چۆن و، بۆ چ شتانێك و، بە چ شێوازێك دووعا بكرێ؟

بـابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ والصَّلَاةُ والسَّلَامُ عَلَي أَشْرَفِ الخَلْقِ أَجْمَعِينَ وخَاتَمِ الأَنْبِياء والمُرْسَلِينَ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وآله أجمعين.

كاك شەریف گیان!

ئەمشەو لەبارەی دووعا و پاڕانەوەوە تۆزێك قسەت بۆ دەكەم.

خوای پەروەردگار گەلێك لە دووعا و پاڕانەوەی پێغەمبەرانی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، بۆ نموونە:

لە سووڕەتی (إبراهيم)دا كە دووعایەكی دوور و درێژیی پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه الصلاة والسلام) خوای بەبەزەیی نەقڵی كردووە (باسی كردۆتەوە)، هەروەها دووعایەكەی نووح (عليه السلام) كە پێغەمبەر نووح دووعا لە گەلەكەی دەكات، وەك خوای زاڵ و زانا لە سووڕەتی (نوح)دا دەفەرمووێت:

﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾﴾ نوح.

واتە: [نووحیش گوتی: پەروەردگارم! هیچ کام لە کافران لەسەر زەوی مەهێڵە].

هەروەها پێغەمبەرانی دیکە (سەلامی خوایان لێبێ). لووت، عیسا، مووسا، کە لە خوای بەرز دەپاڕێنەوە وەك خوای میهرەبان لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرمووێت:

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ ﴾ یونس.

واتە: [مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارمان! بەڕاستیی تۆ خشڵ و سامانی زۆرت لە ژیانی دونیا بەخشیوە بە فیرعەون و دارودەستەکەی، ئەی پەروەردگارمان! ڕێگای ڕاست بە خۆیشیان و بە نەتەوەکەیشیان چەواشە دەکەن، دەسا ئەی پەروەردگارمان! ماڵ و سامان و داراییەکەیان لەنێو بەرە و شوێنەواریان مەهێڵە، دڵ و دەروونیان زۆر قورس و ڕەق و ڕەشبکە، کە هەتا سزای ئێش پێگەیەنەر نەبینن و تووشی نەبن، بڕوا ناهێنن].

ئنجا خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (یونس)دا لە وەڵامیدا فەرمووی:

﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا ﴾ یونس.

واتە: [خوا فەرمووی: پاڕانەوەکەتان گیرابوو].

کەواتە: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) کە باشترین مرۆڤ بوون لەلای خوای پەروەردگار و لە هەموو کەس زیاتر خوایان ناسیوە و، باشتر تێگەیشتوون، یەکێك لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانیان بریتی بووە لە دووعا و پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار و داوالێکردنی. کەواتە: پاڕانەوە لە خوا (سبحانە وتعالی) بەپێی ئەوەی تەماشای قورئانی بەپێز دەکەین، دووعا یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ئەو بەندانەی کە لە هەموو کەس چاکتر خوایان ناسیوە و، نزیکتربوون لە پەوەردگار. هەروەها خوای پەوەردگار لە چەند شوێنێکی قورئانی بەپێزدا فەرمانی کردووە کە ئێمە لێی بپاڕێینەوە، وەك لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێت:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠﴾ غافر.

واتە: [پەروەردگارتان فەرموویەتی: داوام لێبکەن و لێم بپاڕێنەوە، منیش وەڵامتان دەدەمەوە، بەڕاستیی ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانن (کە بمپەرستن) بە سەرشۆڕیی و بچووکیی دەچنە دۆزەخەوە].

ئنجا هەر لەو بارەیەوە خوای بەخشندە لە سووڕەتی (البقرە)دا دەفەرموویت:

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ البقرة.

واتە: [هەر کاتێك بەندەکانم پرسیاریان لێ کردی دەربارەی من، بێگومان من لێیان نزیکم، نزای نزاکاران گیرا دەکەم هەرکاتێك هاوار و نزام لێ بکەن].

هەروەها خوای میهرەبان لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموویت:

﴿ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾﴾ الأعراف.

واتە: [دووعا و نزا لە پەروەردگارتان بکەن بە زەلیلیی (کڕووزانەوە) و پەنهانیی (بەنهێنی)].

ئەوە شێوازێك، شێوازێکی دیکەی دووعا ئەوەیە کە خوای بەبەزەیی لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەمووێت:

﴿وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ الأعراف: ٥٦.

واتە: [لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە بە ترس و ئومێدەوە] واتە: هەم ترست هەبێ لە سزای خوای پەروەدگار لەسەر هەڵە و

كەموكورتییەكان، هەم ئومێدیشت هەبێ بە ڕەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگار.

هەروەها ئەگەر سەیری سوننەتی پێغەمبەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بكەین، لە بارەی پاڕانەوەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە:

{الدعاء هو العبادة}[1] واتە: [پاڕانەوە بریتییە لە خواپەرستیی].

لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتووە دەفەرمووێت:

(الدَّعَاء مُخُّ الْعِبَادَهِ)[2] واتە: [مۆخ و كرۆكی عیبادەت دووعایە].

شێوازی دووعاش خوای بەخشەر لە قورئانی بەڕێزدا باسی كردووە، وەك گوتم بە كڕووزانەوە، بە پەنهانیی و داماویی دەربڕین، بەو شێوەیەی لە ئایەتەكاندا باسكراوە.

---

١) أخرجه أحمد برقم (١٨٤١٥)، وابن أبی شيبة برقم: (٢٩١٦٧)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٧١٤)، وأبو داود برقم (١٤٧٩)، والترمذي برقم (٢٩٦٩) وقال: حسن صحيح ، والنسائی فی الكبرى برقم (١١٤٦٤)، وابن ماجه برقم (٣٨٢٨)، وابن حبان برقم (٨٩٠)، والحاكم برقم (١٨٠٢) وقال: صحيح الإسناد. والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٥م) . وأخرجه أيضًا: الطبراني فی الصغير برقم (١٠٤١).

٢) أخرجه الترمذي برقم (٣٣٧١) وقال: غريب. وأخرجه أيضًا: والحكيم (١١٣/٢)، والديلمی (٢٢٤/٢، رقم ٣٠٨٧).

پێغەمبەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە یەكێك لە جەنگەكاندا لەسەفەرێكدا، گوێی لە هاوەڵانی بوو كە لە خوای پەروەردگار دەپاڕانەوە بە دەنگی بەرز، پێغەمبەریشمان فەرمووی:

{إرْبَعُوا علَى أنْفُسِكُمْ، إنَّكُمْ ليسَ تَدْعُونَ أصَمَّ وَلَا غَائِبًا}[1]

واتە: [ئێوە ئاگاتان لەخۆتان بێ (واتە خۆتان ئەزیەت مەدەن) ئەوەی كە ئێوە لێی دەپاڕێنەوە، نە نادیارە و نە ئەوەیە كە گوێی لێتان نەبێ (خوای میهرەبان ئاگای لێتانە)].

كەواتە: لە دڵی خۆتدا لە خوای پەنهانزان بپاڕێیەوە هەر پێی ئاگادارە، بەڵام مادام خوای پەروەردگار ئەو دووعایانەی لە پێغەمبەران گێڕاوەنەوە، دیارە بە زمان و بە ئاشكرا دەریانبڕیون و، پێغەمبەری خۆشمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زۆر دووعای لێ گێڕدراونەوە و زۆر لە خوای بەبەزەیی پاڕاوەتەوە لە زۆر مەقامدا.

ئەمما چۆن لێی بپاڕێیەوە و، بۆچی لێی بپاڕێیەوە؟ ئەوە دەكەوێتەوە سەر خۆت. بەڵام ئەوەی زۆر لەو مەلایانەی (سعوودیە) دەیكەن و زۆرێك لە مەلایەكانی خۆیشمان تەقلیدیان دەكەنەوە و چاویان لێ دەكەن، ئەو هەموو دووعایانە دەكەن، بە نیو سەعات تاوەكو تەواویان دەكەن! ئەوە هیچ نییە و ڕاست

١) أخرجه البخاري برقم (٢٨٣٠)، ومسلم برقم (٢٧٠٤).

نییه! دووعا ئەوەیە کە تەعبیر بکات لە حەق و پێویستییەکەی خۆت، تەعبیر بکات لە ناخی خۆت، نەك تۆ بێی لە دووعایەکدا باسی عەرش و قورش بکەی، تۆ کاتێك لە خوای بەخشەر دەپاڕێیەوە، دەبێ چەند مەبەستێك لە دڵی خۆتدا دیاریی بکەی و بۆ ئەو مەبەستە دیاریکراوانە لە خوای پەروەردگار بپاڕێیەوە، بەڵام باسی عەرش و قورش بکەی، باسی دونیا و دوارۆژ بکەی، باسی هەموو کەس و هەموو شتێك بکەی، بەتایبەتی هەندێ جۆرە دووعا، چونکە لە حەدیسی پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەیە کە لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرمووێت:

﴿ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾﴾ الأعراف.

پێغەمبەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت:

{يَعتدونَ فِي الطُّهورِ والدُّعاء}.[1]

واتە: [لە ئۆممەتی من کەسانێك دەبن کە لە پاڕانەوەدا و لە پاکوخاوێنییدا تێدەپەڕێنن (واتە: تووشی وەسوەسە دەبن)].

---

١) أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٢٩٤١١)، وأبو داود برقم (٩٦)، وابن ماجه برقم (٣٨٦٤)، وأحمد برقم (١٦٨٤٢)، وابن حبان برقم (٦٧٦٣)، والحاكم برقم (٥٧٩)، والبيهقي برقم (٩٠٠) .

بۆ وێنە: وتاربێژێك دەپاڕێتەوە و دەڵێ: خوایە! هەرچی کافرە بیکوژە، ژنیان بێوەژن بکە، منداڵیان هەتیو بکە، هەرچی قەرزدارە قەرزی بدەوە، هەرچی نەخۆشە چاکی بکەوە...هتد. ئەو جۆرە دووعایانە بۆ زانیاریت کوڕی خۆم! هیچیان شەرعیی نین و پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قەت دووعای وا گشتیی نەکردووە، بڵێ: خوایە! هەرچی قەرزدارە قەرزی بدەوە، هەرچی نەخۆشە چاکی بکەوە، هەرچی ژنی نەهێناوە ژنی بۆ بێنە...هتد، شتی وا نییە بەڵکو پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ کەسێکی دیارییکراو، بۆ حاڵەتێکی دیارییکراو، دووعایەکی دیارییکراوی لە پەروەردگار کردووە. مرۆڤ دەبێ بزانێ چۆن دووعا دەکات و، بۆ چ شتێك لە خوای پەروەردگار دەپاڕێیەوە، ئنجا بە دڵێکی پاکیش و بە ئاگا لەخۆبوونەوە بپاڕێتەوە، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت:

{أدْعُوا اللهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَهِ}.[1]

واتە: [لە خوا بپاڕێنەوە و دڵنیابن وەڵام دەدرێنەوە].

---

١) أخرجه الترمذي برقم (٣٤٧٩) وقال: حديث غريب. والحاكم برقم (١٨١٧)، وقال: مستقيم الإسناد. وتعقبه الذهبي في التلخيص بأن فيه صالح المري متروك. وأخرجه أيضًا: ابن أبي حاتم كما في تفسير ابن كثير (٤/٧٥)، والطبراني في الأوسط برقم (٥١٠٩)، وابن عدي (٤/٦٠، ترجمة ٩١٢ صالح بن بشير أبو بشر المري) وقال: قال البخاري: منكر الحديث، والرافعي: (٣/٣٢٩).

چونکه پاڕانەوەی بەندە لە خوا، مەرج نییە ئەو شتەت بۆ جێبەجێ بکات کە داوای دەکەی و بۆی دەپاڕێیەوە، ڕەنگە چاکتر لەوەت پیشان بدات، یان بەقەدەر ئەوە بەڵات لێ لادەدات، یان بۆ قیامەت پاداشتت دەداتەوە. هیچ دووعایەکی ئینسانی مسوڵمان زایە نابێ، هەمووی وەڵامی هەیە، بەڵام شەرت نییە ئەوەی تۆ دەتەوێ، ڕێك ئەوە بێ، چونکە جاری وایە مرۆڤ داوای شتێك دەکات، خێری ئەو کەسەی تێدا نییە و خوای پەردوەردگار باشتر لەوەی بۆ دەکات.

ئەوە کورتەیەك بوو لەبارەی دووعا و پاڕانەوەوە، ان شا الله سوودی لێ دەبینی.

والسلام عليكم ورحمة الله




## عاقیبەتی مرۆڤ لە نێوان چاکە و خراپە، خواپەرستیی و حەزپەرستییدا

شەریف: مرۆڤ لە دونیادا دەستی کراوەیە لەوەی خراپە بکات یان چاکە. ڕێی ڕاست هەڵبژێرێ یان لارەڕێ. ئەوە مافێکە خوای پەروەردگار داویەتی بە هەموو مرۆڤێك. هەردوو ڕێگا پێویستیان بە خۆماندووکردن و کاربۆکردنن، مرۆڤ بەبێ هەوڵدان نە چاکەی بۆ دەکرێ نە خراپە. بەڵام جیاوازیی چاکە و خراپە ئەوەیە مرۆڤی چاکەکار بەردەوام دڵی لە کەشێکی ئارام و ئاسوودەدایە، لەلای خەڵك خۆشەویست و ڕێزلێگیراوە و، لە قیامەتیش سەربەرز و بێخەمە، ڕێبوارانی ڕێی خراپەش بە پێچەوانەوە.

بابە گیان! پرسیاری ئەمجارەم ئەوەیە، جیاوازیی ژیان و سەرەنجامی کەسێکی چاکەکار و خواپەرست و، کەسێکی خراپەکار و حەزپەرست، چییە و چۆنە؟

بـابــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

كاك شەریف گیان!

ئەمشەو بۆت باسی ئەوە دەكەم كە ئەگەر ئینسان لە ڕێی شەریعەت لابدات و، بكەوێتە شوێن ئارەزووە ناشەرعییەكانی چۆنە و، ئەگەر خۆی مەلزەمبكات و خۆی كۆنترۆڵ بكات، شوێن ئارەزووە ناشەرعییەكانی نەكەوێ، ئەویش چۆنە؟!

خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێت:

﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾﴾

واتە: [ئنجا هەر كەسێك یاخی بێت و ژیانی دونیا هەڵبژێرێت (ژیانی دونیا هەڵبژاردن واتە: بكەوێتە شوێن ئارەزووە ناشەرعییەكانی ژیانی دونیای)].

﴿فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾﴾

واتە: [سەرەنجامی (شوێنی حەوانەوەی) بریتییە لە كڵپەی ئاگری دۆزەخ].

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ النازعات.

واتە: [بەڵام کەسێك لە پێگە و پایەی پەروەردگاری بترسێ، سام و هەیبەتی هەبێ بەرامبەر پەروەردگاری و نەفسی خۆی، لە ئارەزووەکانی بگێڕێتەوە، ئەوە جێگا و شوێنی مانەوەی بەهەشتە].

تەماشا بکە کوڕی خۆم! لە ئەنجامی سام و هەیبەت هەبوون بەرامبەر بە خوا (سبحانە وتعالی) ئینسان دەتوانێ جڵەوی خۆی بەدەستەوە بگرێ، یان کۆنترۆڵی خۆی بکات، غەریزەکانی کۆنترۆڵ بکات، سەرەنجامیش ئەوە دیارە هەم بۆ دونیا سەربەرزییە، هەم بۆ دوارۆژیش. بەڵام لە ئەنجامی یاخیی بوون بەرامبەر بە خوا، چونکە (طغیان) واتە: سەرکێشیی و یاخی بوون، لە ئەنجامی یاخیی بووندا بەرامبەر بە خوا، ئینسان جڵەوی دەکەوێتە دەست ئارەزووەکانی و، ژیانی دونیا هەڵبژێرێ، ئەوە جێگای دۆزەخە هیچ گومانی تێدا نییە.

خوای پەروەردگار لەسەری پێویست کردووین بەندایەتیی بۆ بکەین و لەسەری پێویست کردووین فەرمانبەری بین، هەروەها لێی قەدەغە کردووین کە بێبڕوابین، یان هاوبەش بۆ خوا دابنێین، یاخود بەلاڕێدا بڕۆین، تووشی گوناح و تاوان بین، هیچ

گومـانی تیـدا نیـیه بـۆ قـازانجی خۆمـانیەتی. ئەگەر تـاعەت بکەین، خۆمان بەهرەمەنـد دەبین و، ئەگەر تاوان بکەیـن خۆمـان زەرەرمەنـدین. خـوای پەروەردگـاریش قـازانجی بەنـدەکانی پـێ خۆشە و زەرەر و زیانیانی پێ ناخۆشە.

بـا تەماشـا بکەیـن: خـوا (سبحانه وتعالى) لە سـوورەتی (مـریم)دا باسـی پێغەمـبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکـات، سەرەتا باسـی (إبـراهیم) دەکـات، بەڵام دوای ئەوەی کە باسـی (زەکەرییا) و (یەحیا) و (عیسا) و (مـریم) دەکات (سەڵات و سەلام لەسەر هەموویان بێت)، دوایی دەفەرموویێت:

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ٤١﴾ مريم.

ئنجا باسـی وتـووێژ و دایەلۆگەکەی دەکـات لەگەڵ بابیـدا، دوایی دەفەرموویێت:

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥١﴾ مريم.

ئنجا باسی (هارۆون)ی برای دەکات، دوایی دەفەرمووێ:

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤﴾ مريم.

دوایی دەفەرموویێت:

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ٥٧﴾ مريم.

دواتر دەفەرمووێ:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾.

واتە: [ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردبوون لە پێغەمبەران].

﴿مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ﴾.

واتە: [لە وەچەی (ئادەم) و لەوانەی کە لەگەڵ (نووح)دا لە کەشتییەکەدا هەڵمان گرتن و، لە وەچەی (إبراهیم) و (ئیسرائیل) (واتە یەعقووب).

﴿وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ﴾.

واتە: [لەوانەی کە ڕاستەڕێمان کردوون و هەڵمان بژاردوون].

ئنجا ئایا چۆنیان وەسف دەکات؟

﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ۩ ٥٨﴾ مریم.

کاتێك کە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار و بە بەزەییان بەسەردا خوێندرابانەوە، لە پەڕوو دەکەوتن و بە گریانەوە و کڕنووشیان دەبرد.

ئەوە بە نسبەت پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) باس دەکات، دوایی دەفەرمووێت:

﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ﴾.

واتە: [بەڵام پاشینێکی خراپیان هاتنەجێ].

لە زمانی عەرەبییدا (خَلَـف) یانی پاشینی خراپ، یانی: کەسانێك کە دێنە جێی کەسانێکی چاك، بەڵام خراپن. بەڵام ئەگەر (خَلَـف) خەلەف بێ، یانی: پاشینێکی چاك، لێرەش دەفەرمووێت:

﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ﴾.

واتە: کەسانێکی باش، پاشینێکی خراپ هاتنە شوێنیان، هاتنە شوێنی ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلا ) چیانمکرد؟

﴿أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾.

واتە: [نوێژیان زایەکرد و شوێن ئارەزووەکانیان کەوتن].

کەواتە: نوێژ زایەکردن، لەگەڵ شوێن ئارەزووکەوتندا، دوو شتی تێکهەڵکێشن، هەر کەسێك نوێژی زایە کرد، شەیتان زەفەری پێ دەبات و دەیخاتە شوێن ئارەزووەکانی، دوایی سەرەنجامیان چۆن دەبێت؟!

﴿فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ٥٩﴾ مریم.

واتە: [لەمەودوا تووشی بێ مرادیی دەبن].

ئنجا کوڕی خۆم! (عەتاڵای ئەسکەندەریی) کە یەکێکە لە عاریفە گەورەکان، قسەیەکی زۆر جوان دەکات دەڵێت: "من لم تکن لە بدایة محرقە لا تکون لە نهایة مشرقة" واتە: [هەر

کەسێك سەرەتایەکی گەرم و ڕۆشنی نەبێ (سەرەتایەکی سوتێنەر و گەرمی نەبێ) ئایندەیەکی ڕۆشن و ڕووناکی نابێ] یانی: بەبێ هەوڵدان و خۆماندووکردن، ئینسان بە هیچ ناگات، کاتی خۆی کە لە پۆلی دووی ناوەندییەوە چوومە سلێمانی بۆ خوێندن و تاکو شەشی ئامادەیی هەر لە سلێمانی بووم، پێنج ساڵ لەوێ بووم. ئەوکاتە سەرەتای گەنجیەتییم بوو، زۆر تەرکیزم لەسەر لایەنی ڕووحیی دەکرد، لەسەر عیبادەت و تاعەت، مەگەر چۆن ئەگەرنا ڕۆژنارۆژ بەڕۆژوو دەبووم، پێنج شەم و دوو شەم ئەوە هیچ، ئنجا عیبادەتی زیادەم دەکرد، شەو نوێژم دەکرد، قورئانم دەخوێند، هەمیشە خەریك بووم، هەندێك لە نەقشبەندییەکان هەبوون لە مزگەوتێکدا ڕابیتەیان هەبوو زکریان دەکرد، دەچووم بەشدارییم دەکردن، یادی مردن و یادی خوا و...هتد، کتێبی (أحياء علوم الدين) زۆر پێی کارتێکراو بووم. هەروەها کتێبەکانی دیکەی تەزکییە و تەصەووف، ئەوە سەرەتایەکی ڕووحیی و ئیمانیی بەهێز بوو بۆ من. بێگومان ئەگەر ئینسان لایەنی تەقوا و تەزکییە و لایەنی ڕووحیی بەهێز نەبێت، بەرهەڵستیی ئارەزووەکان و بەرهەڵستیی کارتێکەرە خراپەکانی بۆ ناکرێ.

ئنجا من ئامۆژگاریت دەکەم لەو ڕووەوە خۆت بەهێزبکە، ئیمان وەك چرا وایە: چرا ئەگەر نەوتی تێنەکەی، چرایەك

ئەگەر بە نەوت ئیشبكات، یان گڵۆپێك ئەگەر تەزووە كارەبایەكەی بۆ نەیەت، وزەی كارەبای بۆ نەیەت، گڵۆپەكە نائایسێ (ئیش ناكات)، چرایەكە تا نەوتی تێدابێ دەئایسێ، بەڵام ئەگەر نەوتی لێ بڕا، پڵیتەكەی دەسووتێ و دەكوژێتەوە، ئیمانیش بە تاعەت زیاد دەكات و بە گوناح كەم دەكات. هیچ گومانی تێدا نییە ئیمان بە تاعەت زیاد دەكات، ئەگەر ئیمانەكە وەك چرایەكە بێت، تاعەتەكەش وەك نەوتەكە وایە، كە تێی دەكەی، یان وەك تەزووە كارەبایەكە وایە، كە لەسەری دەبێت، لەگەڵ تاعەتی لێبڕا، ئیمان كەم دەكات، هەمیشە شوێنی تاعەت، گوناح دەیگرێتەوە. كەسێك كە نوێژی نەكرد، شوێنی نوێژەكە، شتێكی پێچەوانەی نوێژ دەیگرێتەوە، كە ڕۆژووی نەگرت، پێچەوانەی ڕۆژوو شوێنەكەی دەگرێتەوە، هەروەها كە یادی خوای نەكرد، پێچەوانەی یادی خوا، شوێنی دەگرێتەوە.

ئنجا ئینسان دەبێ لە خۆی وریابێ (إبن قيم الجوزية) كە زانایەكی بەرز و عاریفێكی گەورەشە، دەڵێ: "ئەگەر نەفسی خۆت بە حەقەوە سەرقاڵ نەكرد، نەفست تۆ بە ناحەقەوە سەرقاڵ دەكات". دەبێ تۆ ئاگات لەخۆت بێت، خۆت بە حەقەوە مەشغووڵ بكەی، بۆ ئەوەی ئەو بە ناحەقەوە مەشغووڵت نەكات.

لە کتێبی (مدارج السالکین)دا دەڵێ: "نەفس وەك بەرداش و دەستارێك وایە، وەك ئاشێك وایە ئەگەر هیچی دەست نەکەوت خۆی دەهاڕێت".

ئنجا هیچ گومانی تێدا نییە کە بەبێ تاعەت و بەندایەتیی بۆ خوا و، بەبێ یادی خوا، بەبێ تەزکییەی نەفس و تەقوا، ئەویش بەبێ خۆماندووکردن نابێ، بەبێ ئەو شتانە ئیمان، گەشە ناکات، خوا فەرموویەتی:

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩﴾ الشمس.

واتە: [سەرفرازە ئەو کەسەی نەفسی خۆی گەشە پێ دەدات (پاکی دەکاتەوە گەشەی پێ دەدات و چاکی دەکات).

﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ الشمس.

واتە: [پەشێمان و بەدبەختە، ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی دەشارێتەوە، لەبن گوناح و تاوان و چڵك و چەپەری گوناح و تاواندا].

دوا قسەم لەو بارەوە هەرچەندە ئەمشەو تۆزێ ئامۆژگارییەکەم بۆ درێژ کردیەوە، بوو بە دە (١٠) دەقە. فەرمایشتێکی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە دەفەرمووێت:

(إذا أذنب العبدُ ذنبًا نكت في قلبِه نُكتةٌ سوداءٌ، فإنْ تاب واستغفر صَقُل قَلْبهُ، وإن تتابعت الذنوب، تتابعت النكت السّوداء حتَّى يكون الـرين، فـذلك قولـه سـبحانه و تعـالى: ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾)[1].

واتە: [هەرکات بەندە گوناحێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێت، ئەگەر گەڕایەوە و داوای لێبوردنی کرد، دڵی سپی دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گوناحەکان بەردەوام بوون خاڵە ڕەشەکانیش بەردەوام دەبن، تاکو دەبێتە ژەنگ]. کە ئایەتەکە دەفەرمووێت:

﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ المطففين.

واتە: [با واز بێنن، بەڵکو دڵیان کەمەرەی بەستووە و ژەنگی هێناوە، بەهۆی کردەوەکانیانەوە].

کەواتە: وەك چۆن دڵ و دەروونی ئینسان بە تاعەت سپی و ساف و پاك و چاك دەبێت، بەهۆی تاوانیشەوە، چڵکن و پڵکن و ژەنگ گرتوو دەبێت. هەروەها حەدیسێکی دیکەی پێغەمبەر هەیە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێت: (إنَّ هذه القلوب تَصْدَأ

١) أخرجه الترمذي برقم: (٣٣٣٤) وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى برقم: (١٠٢٥١)، وابن ماجه برقم: (٤٢٤٤)، والحاكم برقم: (٦) وقال: صحيح، وسكت عنه الذهبي.

كما يَصْدَأُ الحديدُ) واتە: [ئەم دڵانە ژەنگ دێنن، وەك چۆن ئاسن ژەنگ دێنێت]. (قيل وما جِلاؤها؟) گوتیان: بەچی سپی دەبێتەوە؟ (قال: تلاوة القرآن و ذكر الموت)[١] [فەرمووی: بە قورئان خوێندن و یادی مردن]. ئا ئەوە ژەنگی سەر دڵ لادەبات، ئەوەش ئامۆژگاریی ئەمشەومان بوو.

خوا پشتیوان بێ لێی بەهرەمەند دەبی.

١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان برقم (٢٠١٤).




## کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

شەریف: وێڕای ئەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کارئاسانیی زۆریان بۆ خەڵك کردووە، بەڵام لەهەمان کاتدا بوونەتە هۆکاری لاڕێ بوونی خەڵکێکی زۆریش. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، دونیایەکی وەهمیی و ساختە بۆ خەڵك دروست دەکەن، کەسێك ئەوەی لە دونیای ڕاستیدا ناتوانێ دەستی پێبگات، یان شایانی نییە، لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا دەیکات، بۆ وێنە: خەڵك هەیە دەبێ بە نووسەر، مۆدێل، شاعیر، یان وتاربێژ بەڵام لە دونیای ڕاستییدا ئەو کەسانە هیچیان لەباراندا نییە و، ڕەنگە تەواو پێچەوانەی کەسایەتییە ڕاستەقینەکەیان بێ. لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا خەڵکی کەسایەتیی و قەبارەی خۆیان لێ ون دەبێ، یان لە جیاتی ئەوەی ئەو فلان ئامێرە بەکاربێنێ، خودی کەسەکە بەکاردەهێندرێ. کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، نەك خراپ بەڵکو

کـــاریگەریی زۆر ژەهراویـــی لەســـەر فیکـــری تـــاك و کۆمەڵگـــا بە گەورە و گچـــکەوە، بەجێـــدێڵێ و دڵـــی کەسەکان تووشـیی چەنـدان نەخۆشـی دەکـات، چـونکە لەوێ کردنـی هەر شـتێك، بە تـایبەت شـتی خـراپ، زۆر ئاسانە و ڕێگـا کـورتکراوەتەوە، پێویسـتیی بە مانـدووبوون نیـــیە. بـــۆیە خەڵکێکـــی زۆر ئەوەنـــدەی لە تـــۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا دەژیـن، هێنـدە لە دونیـای ڕاسـتیدا نـــاژین، لە هەمـــووی خراپتـــر، خەڵکـــی لەوێ تووشـــی دووڕوویـی دەبـن، ڕەنـگە دەسـتەواژەی دووڕوویـی بـۆ ئەم سـەردەمە زۆر ڕاسـت نەبـێ، چـونکە بەشـێك لە خەڵکـی ئێسـتا زیـاتر لە دوو ڕوویـان هەیە، بە شـێوەیەکن، ڕەنـگە زۆرجـار خۆشـیان لێیـان تێکبچـێ کـامە کەسـایەتیی ڕاستەقینەی خۆیانە! تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دونیایەکی تاریکن، دەگونجێ شتی زۆر باش و کەسی باشی لێبێ، بەڵام بەبـێ ڕوونـاکیی و چـرای ئیمـان و تێگەشـتنێکی پتەو و دامەزراو، مرۆڤ زۆر زوو لاڕێ دەبێ و خۆی ون دەکات.

بـــابە گیـــان! ئامۆژگـــاریی جەنابـــت چیـــیە، تـــۆڕە کۆمەڵایەتییەکـــان و ئـــامێرە ئەلیکترۆنییەکـــان چـــۆن بەکاربهێندرێن؟

بـابـــەم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمدالله، وصلى الله تعالى وسلم على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه.

كاك شەریف گیان!

(سۆشیال میدیا) و ئامێرە ئەلیكترۆنییەكان بە گشتیی وەك تیغێكـی دوو دەم وان، بە هەردوو باراندا دەبڕن. هەم بە باری خێردا، هەم بە باری شەڕدا. لە لایەكەوە بێگومان، بەهۆی ئەو ئامێر و ئامرازانەوە؛ هەم مەودای كات، هەم مەودای شوێن بۆ خەڵك زۆر نزیك كەوتۆتەوە، خەڵك دەتوانێ بە پەنجە لێدان و دووگمە داگرتنێك، هەرچیی بیهەوێ بێتە بەردەستی: لە زانیاریی، وێنە، نووسراو، بیستراو یان بینراو. ئەوە بێگومان ئاسانكاریی و ڕێ كورتكردنەوەیەكی زۆرە بۆ خەڵك. ساڵ و زەمانانی پێشوو، كتێب و نووسراو بەشێوەیەكی زۆر نەبوو، دەبوو خەڵك ڕۆشتبایە بۆ شوێنی دوور تا نوسراوێك یان كتێبێكی

دەســـتكەوتبا. بەڵام ئێســـتا زۆر ئاســـانكاریی هەیە و، ئەوەی بتەوێ دەتوانیێ دەستت بكەوێ.

بەڵام ئەو ئامێرانە، كوڕی خۆم، وەك تیێغێك وان، بە هەردوو دیواندا دەبڕن. بە باری خێر و شەڕدا بەكاردەهێندرێن. دەكەوێتە سەر ئەوەی ئایا بەدەست كێوەن؟ ئەگەر بە دەست مرۆڤی باشەوە بن و، ئیرادەیەكی باش لە پشتەوەیان هەبێ، بە باری خێردا دەیانسوورێنێ و ئەگەر خوانەخواستە بەدەست مرۆڤی خراپەوە بن، بە باری شەڕدا دەیان سووڕێنێ.

بۆ هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەو ئامێرەنەدا، دەبێ مرۆڤەكە باش بكرێ. ئەگەر مرۆڤەكە خودی خۆی باش بێ، ئیرادە و ویستێكی باشی هەبێ، هاندەرێكی باشی هەبێ، بەدوای شتە باشەكاندا دەگەڕێ، لە جیاتی ئەوەی ڕوو بكاتە شتی خراپ، ڕوو دەكاتە شتە چاكەكان. كەواتە: مرۆڤەكەیە دەبێ چاك بكرێ، ئەگەرنا ئامرازەكە خۆی لە خۆیدا بێلایەنە، بۆیە لە قوڕئاندا، زۆر جێی سەرنجە، خوای پەروەردگار ئەو شتانەی كە ئامرازی شت زانینن، خوا نە مەدحی كردوون، نە زەمی كردوون. بۆ وێنە:

﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ الإسراء.

کەواتە: لە خاوەنەکەیان دەپرسرێتەوە، نە عەقڵ، نە دیتن، نە بیستن، لە قورئاندا، نە زەم کراون نە مەدح کراون، بەڵکو شێوەی بەکارهێنانەکەیان مەدح و زەم دەکرێ، بەڵام دڵ کە چەقی بڕیاردانە، لە قورئاندا ستاییش کراوە، لە ڕووی کردەوە و قسەی چاکە و خێر و، زەمیش کراوە لە ڕووی کردەوە و قسەی خراپەوە، بۆ وێنە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

ا. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ﴾ المجادلة: ٢٢.

ب. ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ الرعد.

ج. ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧﴾ الفجر.

کەواتە: تەماشا دەکەین دڵ و دەروونی باش مەدح دەکرێ. هەروەها بە باری خراپەش زەم دەکرێ:

ا. ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡ﴾ البقرة: ٧.

ب. ﴿طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ محمد: ١٦.

ج. ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ١٤﴾ المطففين.

واتە: دڵیان مۆر کراوە، دڵیان ژەنگی هەڵهێناوە.

کەواتە: ئەوەی لە مرۆڤدا زەم دەکرێ، یاخود مەدح دەکرێ، بریتییە لە چەقی بڕیاردانی، ئەگەرنا چاوەکەی، عەقڵەکەی، بیستنەکەی، دەتوانێ چاکە و خێریان پێ بزانێ و ڕوویان پێ لە چاکە و خێر بکات، یانیش بە پێچەوانەوە. ئەو ئامرازانەش بەهەمان شێوە، لە زاتی خۆیاندا بێ لایەنن، بەڵام دەکەوێتە سەر ئەوەی چۆن بەکاردەهێندرێن و بۆ چی ئامانج و مەبەستێك بەکاردەهێندرێن؟!




## کاردانەوە
## لەکاتی خۆشیی و ناخۆشییدا

شـەریف: مـرۆڤ لە خۆشـیی و ناخۆشـییدا، پەنـا دەبـاتە بەر شـتانێك بـۆ دڵ ئـارامگرتن یـان دەربڕینـی دڵخۆشـیی. کەسانێك پەنا دەبەنە بەر شتە پیسەکان و، خەڵکیش هەیە دڵخۆشیی خۆی بە سوپاسگوزاریی بۆ خوا دەردەبڕێ. وەك چۆن ئەوەندەی پرسیار کەسایەتیی کەسی پرسیارکەر دەردەخـا، وەڵامەکەی ئەوەنـدە دەرینـاخـات، ئەو شـتانەی مـرۆڤیش لە کـاتی خۆشـیی و ناخۆشـییدا، پەنایـان بـۆ دەبـات کەسـایەتیی و نـاخ و نێـوەڕۆکی ئەو کەسـە دەردەخەن. کەسێك زۆر پابەندی شـەریعەت بێ، لە کـاتی ناخۆشـییدا کـاردانەوەیەکی شـەرعییانەی دەبـێ. وەك گـوتراوە: گـۆزە چـی تێـدابوو ئەوەی لـێ دەڕژێ. بە ئەنـدازەی نزیکییمـان لە خـوای پەروەردگـار و بەخشـەرەوە،

کاردانەوەکانمان بۆ ناخۆشیی و خۆشییەکان، کاردانەوەی ڕاست و دروست و هاوسەنگ دەبن.

بابە گیان! مرۆڤ کاردانەوەی دروستی چۆن بێ لە کاتی خۆشیی و ناخۆشییدا؟

بابم:

کاك شەریف گیان!

**یەکەم:** بێگومان کە خوا مرۆڤی لەسەر ئەم زەویە داناوە، ژیانی هیچ مرۆڤێك مسوڵمان بێ یان نا، لە گرفت و کێشەو دەردەسەریی خاڵیی نابێ وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦﴾ الانشقاق.

واتە: [ئەی مرۆڤ! تۆ ڕەنج دەدەی تا دەگەیە پەروەردگارت و، بە پەروەردگاریشت دەگەی].

هەروەها خوای مەزن دەفەرمووێ:

﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ٤﴾ البلد.

واتە: [بێگومان مرۆڤمان لە ڕەنج و نارەحەتییدا هێناوەتە دی].

کەواتە: ژیانی هیچ کەسێك لە ناخۆشیی و دەردەسەریی خاڵیی نابێ.

**دووەم:** بـۆ ئەوەی مـرۆڤ بەرهەڵسـتیی نـاڕەحەتیی و گرفتارییەکـان بکـات، دەبـێ چـی بکـات؟ هەڵوێسـتی ڕاسـت ئەوەیە کە جارێ ئەو گرفـت و ناڕەحەتییـانە وەك خـۆی ببینـێ! واتە: خۆی لە ئاستیاندا گێل نەکات و، نادیدەیان نەگرێ، فێڵ لە خۆمـان نەکەیـن نکووڵییـان لـێ بکەیـن، بەڵکـو وەك خۆیـان دانیـان پێـدا بێنـین و، وەك خۆیـان بیـانبینین و مـامەڵەیەکی واقعییانەیان لەگەڵدا بکەین.

ئنجا دوو جۆرە مامەڵە هەن:

**یەکەم:** کە تۆ بێنی ئەو گرفت و کێشەیە لە کوێوە سەری هەڵداوە، ڕەگ و ڕیشەکەی وشك بکەی.

**دووەم:** کە مامەڵەیەکی هەڵەیە ئەوەیە کە خۆت لە گرفت و کێشەکان بدزیەوە و خۆت لە ئاستیاندا گێل بکەی.

ئنجا کاك شەریف گیان!

خۆسەرقاڵکردن بە شتانێکەوە کە تۆ بێئاگا بکەن لە گرفت و کێشـەکە. ئەوە وەك هەڵوێسـتی حوشـترمەل (نعامـة) وایە؛ دەڵێن: کە ڕاوچیی دەبینـێ، سەری خۆی لە لمدا نقووم دەکا، پێـی وایە ئەگەر ئەو ڕاوچیـی نەبینـێ، ڕاوچیـیەکەش ئەو نـابینێ. ئەوانەی پەنـا دەبەنە بەر بەکارهێنـانی مـاددە

سەرخۆشکارەکان، یان هەندێ گوناح و تاوان و لادان، بۆ ئەوەی ئاگایان لەو گرفت و کێشانە نەمێنێ، لە ڕاستییدا ئەوانە وەك حوشترمەل دەکەن. هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە کە تۆ گرفتەکە وەك خۆی ببینی و وەك خۆی پێی ئاشنا بی، ئنجا هەوڵبدەی بزانی لە کوێوە هاتووە؟ سەرچاوەکەی وشك بکەی، ڕەگ و ڕیشەکانی هەڵکەنی، بۆ وێنە: کەسێك گرفتاربووە بە نەخۆشییەوە، دەبێ بزانێ نەخۆشییەکە چیەو لە چییەوە پەیدا بووە؟ لە سەرماوە، لە گەرماوە، میکرۆبییە، ڤایرۆسییە! یان بۆ وێنە: کەسێکی دیکە بە هەژاریی و نەدارییەوە گرفتاربووە، دەبێ بزانێ ئەو هەژاریی و نەدارییە هی چییە: هی ئەوەیە کە تەمبەڵی و هەڵدەخزێی، یان لەگەڵ کەسێك شایەستە نییە تێکەڵ بووی، یاخود ئیسراف و زێدەڕۆیی دەکەی، لەقەدەر بەرەی خۆت پێ ڕاناکێشی، یاخود کاسبییەکەت کاسبییەکی حەڵاڵ و بەبەرەکەت نییە، دەبێ تۆ ڕەگ و ڕیشەکەی بدۆزیەوە. یان بۆ وێنە: کەسێك لەگەڵ خەفەت و مەراق و دڵەڕاوکێدا تووش دەبێ، دەبێ بزانێ داخۆ ئەو خەفەت و مەراقەی لەکوێوە تووش بووە؟ لە کوێوە دروست دەبێ؟ دەبێ سەرچاوەو ڕیشەکەی بدۆزیەوە و بە شێوازێکی دروست و ڕاست چارەسەری بکەی. ڕووح و دەروونی مرۆڤیش تەنیا بە دۆستایەتیی و نزیکیی لە خوا، ئارام دەگرێ و ئۆخژنی بۆ دێ و شادمان و بەختەوەر دەبێ.




## تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوا

شـەریف: خـوای پەروەردگـار لە چەنـدان شـوێنی قورئانـدا فەرمایشـت دەفەرمـووێ: کە بـڕواداران ئەو کەسـانەن کاتێك خەراپە و تاوان دەکەن، زوو دەگەڕێنەوە لای. ئێستا قەناعەتێك هەیە لەلای هەندێ کەس، پێیان وایە کەسێك کە گەڕایەوە، نـابێ گوناحـان بکـات، یـان کە گونـاحی کـرد، پێویست ناکـات پەلە بکـات لە گەڕانەوە، تـا تەواو دەست لە هەموو شتێك هەڵدەگرێ! لە ڕاستییدا خۆشۆردن و دەموچـاو شوشـتن و خۆپـاکڕاگرتن، چەنـدە گـرنگە بـۆ جەسـتە، تەوبەو گەڕانەوەش بـۆ لای خـوا دوو هێنـدە گرنگە بۆ ڕووح و دڵ. باشە چۆن کەسێك تـاقەتی هەیە هەموو ڕۆژی جارێك خۆی بشوا و بۆنی خۆش لەخۆی بدات و، جلی بەرچاو بپۆشێ، بەڵام تـاقەتی نیە ڕووحێك کە بە ئەوەوە مرۆڤە، ڕۆژی جارێك پاك و خـاوێنی بکـات

و، بە تەوبە و فرمێسکی گەڕانەوە بۆ لای خوا بیشوات؟ تەوبە و گەڕانەوەی ڕاست و ساغ، دڵی مرۆڤ نەرم دەکات، قالبی سووك دەکات بۆ خواپەرستیی و چێژی لێ دەبینێ و، بەرچاوی ڕوون دەبێت لە ژیاندا.

بابە گیان! زەحمەت نەبێ با باسی ئەمشەومان باسێك بێ دەربارەی پێویستیی زوو گەڕانەوە بۆ لای خوا، کەی و چۆن بێ؟

بابم:

دەباشە کوڕی خۆم!

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

ئەمشەو بۆت باسی گەڕانەوە بۆ لای خوا دەکەم (سبحانه وتعالى). بۆ خۆت ئاگاداری من کتێبێکم هەیە بەناوی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا) تاکو ئێستا شەش (٦) جاران چاپ کراوەتەوە. گەڕانەوە بۆ لای خوا، بابەتێکی زۆر گرنگە و زۆریش هەستیارە و زۆر بە لق و پۆلە. جا با من ئەوەت بە چەند دەقەیەك بۆ خولاسەوە بکەمەوە:

گەڕانەوە بــۆ لای خــوا (سبحانه وتعالى) واتە: گەڕانەوە بــۆ لای پابەنــدیی بەرامــبەر شــەریعەت و بەرنــامەی خــوای پەروەردگارەوە، گەڕانەوە بۆ لای بەندایەتیی کردن بۆ خوا. زۆر کەس وادەزانن گەڕانەوە بۆ لای خوا و تەوبە، دەبێت حەتمەن لە گوناح و تاوانەوە بێت، بۆ فەرمانبەریی و چاکە، بەڵام وانییە و هەموو مرۆڤێك پێویستیی بە گەڕانەوە بۆ لای خوا هەیە. پلەی یەکەمی تەوبە ئەوەیە کە ئینسان لە کوفر و شیرك و نیفاقەوە، بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، دەبێ لە کوفرەوە بۆ ئیمان، لە شــیرکەوە بــۆ خــوابەیەکگرتن (توحیــد)، لە نیفاقیشــەوە بــۆ دینداریيەکی ساغ و بێ خەڵتە. پلەی دووەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئەوەیە کە مرۆڤ لە گوناحەوە بگەڕێتەوە بۆ فەرمانبەریی یانی (الرجوع من المعصية إلى الطاعة). گەڕانەوەیەکی دیکە ئەوەیە کە مــرۆڤ لە تــاعەت و فەرمــانبەرییەکی کەمتــرەوە، بگەڕێــتەوە بــۆ تــاعەتێکی چــاکتر. پێغەمــبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە خوای پەروەردگار زۆر باسی گەڕانەوەی کردوون، بە تەئکید پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لە تاعەتێکەوە بۆ تــاعەتێکی چــاکتر و لە بەنــدایەتییەکی بــاش کە بــۆ خــوا ئەنجامیــان داوە، بۆ بەنــدایەتییەکی ســاغتر و تۆختر گەڕاونەوە. ئەگەرنــا پێغەمــبەران (عليهم الصلاة والسلام) شــیرك و کــوفر و نیفاق هەر هیچ، بگرە گوناحیشیان نەبوو، شتێك بزانن گوناحە و

بـیکەن. کەواتە: گەڕانەوەی پێغەمـبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوە بـووە کە لە تـاعەتێکەوە بگەڕێنەوە بـۆ تـاعـەتێکی باشـتر. ئەگەرنا بێگومان ئەوان گوناحیان نەبوون بەو چەمك و واتـایەی: بزانن شتێك خوا پێی ناخۆشەو بیکەن.

ئنجا خـوای پەروەردگـار لە سـوورەتی (الزمـر)دا، کە زانایـان دەڵـێن: ئەو ئایەتـانە ئومێدبەخشـترین ئـایەتن لە قورئانـدا، دەفەرمووێ:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ الزمر.

ئنجـا ئەوانە سـێ ئـایەتن، لە دوای یەك، هەم گرنگیـی گەڕانەوە بۆ لای خوا، هەم چۆنیەتیی و بەرنامەی گەڕانەوە بۆ لای خوامـان بـۆ بـاس دەکەن، سـەرەتا خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێت:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ واتە: [بڵـێ ئەی ئەو بەنـدانەم کە بەرامـبەر بە خۆیـان (دژی خۆیـان) زێـدەڕۆییان کـردووە (واتە: ئەو زێـدەڕۆیی و سەرلێشـواوییە زەرەری بۆخۆیـان هەبووە]. دواتـر دەفەرمـووێ: ﴿لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾ واتە: (لە بەزەیـی خـوا نائومێـد مەبـن). ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ الزمـر:٥٣. واتە: [بە دڵنیـاییەوە خـوا تێکـڕا و وێکـڕا لە

گوناحەکانتان خۆش دەبێ]. (الذنوب) ئەلیف و لامی تەعریفی لەسەرە، واتە تێکڕای گوناحان و (جَمِيعًا) واتە: ویکڕا، لە یەك کاتدا لە هەموو گوناحان خۆش دەبێ. ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: [بێگومان ئەو زۆر لێبوردەی زۆر میهرەبانە].

ئنجا بۆمان باسی چۆنیەتیی گەڕانەوە بۆ لای خوا دەکات، دەفەرمووێ:

﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ٥٤﴾ الزمر.

واتە: [لە ئاخەوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و بۆی ملکەچ بن، بەر لەوەی سزاتان بۆ بێ و پشتیوانییتان لێ نەکرێ].

مەبەست لە سزا، ئازاری سەرەمەرگە، یان سزای دونیایە.

﴿وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةً وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ٥٥﴾ الزمر.

واتە: [شوێن ئەوەش بکەون کە باشترین شتێکە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە (کە قورئانە)].

﴿مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ٥٤﴾ الزمر.

[بەرلەوەی کتوپڕ سزاتان بۆ بێ، بەرلەوەی هەستی پێ بکەن].

ئنجا کوڕی خۆم! خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (التحريم)دا دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾ التحريم: ٨.

واتە: [ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە گەڕانەوەیەکی ساغ بۆ لای خوا بگەڕێنەوە].

(نصوح) واتە ساغ و بێ خەڵتە.

بۆ پرسیارەکەشت 'ئایا مەرجە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، کاتێك هیچ تاوان و هەڵە و گوناحی نەبێ؟'. ئەوەش نەخێر، ئەوە ڕاست نییە، چونکە مرۆڤ بەو مەرجە ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا، کە پارێزراو بێت و گوناح و تاوانی نەبێ، بەڵکو لە فەرمایشتدا هاتووە کە پێغەمبەر دەفەرمووێت (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):

{إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ}[(١)].

---

١) أخرجه أحمد برقم (١٩٥٤٧)، ومسلم برقم (٢٧٥٩)، والدارقطني الصفات برقم (١٨).

واتە: [خوا (سبحانه وتعالى) بەیانیان باڵی بەزەیی ڕادەخات بۆ هەر کەسێك کە بە شەوێ گوناحی کردبن، هەروەها ئێواران خوای پەروەردگار بەزەیی خۆی بڵاو دەکاتەوە، بۆ کەسێك کە بە ڕۆژێ گوناحی کردبن].

یانی: خوا ئێواران لە گوناحی ڕۆژێ خۆش دەبێت و، بەیانیان لە گوناحی شەوێ خۆش دەبێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە، ئەگەر مرۆڤ بەڕاستیی و بە چاکیی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، ئەوە گەڕانەوەکەی وا دەبێت کە نەیشکێنێ. بەڵام ئەگەر جاری وابوو گەڕایەوە، بەڵام تووشی هەڵە و پەڵە بووەوە، ئەوە مانای وانییە کە خوا لێی خۆش نابێت، بەڵکو لە حەدیسێکی دیکەی قودسییدا هاتووە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

{لَوْلَا أَنَّكُمْ تُذْنِبُونَ، لَخَلَقَ اللهُ خَلْقًا، يُذْنِبُونَ يَغْفِرُ لَهُمْ}[1]

[ئەگەر ئێوە گوناحان نەکەن، خوا ئێوە لادەبات و کۆمەڵێکی دیکە دێنێ، گوناحان بکەن و داوای لێبوردن بکەن و خواش لێیان ببورێ].

١) أخرجه أحمد برقم (٢٣٥٦٢)، ومسلم برقم (٢٧٤٨)، والترمذي برقم (٣٥٣٩)، وقال: حسن غريب.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە سیفەتی لێبوردەیی کە لە خوا هەیە (سبحانه وتعالى) ئەو سیفەتە دەبێ کاری خۆی بکات، ئنجا کاتێ ئەو سیفەتە کار دەکات کە بەندەکان گوناح بکەن و داوای لێبوردن لە خوا بکەن و، خواش لێیان ببوورێ.

ئەوەی گرنگە مرۆڤ کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای بەرز و مەزن (سبحانه وتعالى) دەبێ هەوڵ بدات بەپێی توانا ئەو خراپانەی کردوونی، لە شوێنیاندا چاکە بکات، بۆیە خوای میهرەبان دەفەرموویێت:

﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾﴾ الفرقان.

واتە: [مەگەر کەسێك ئیمان بێنێ و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و کردەوەی باش بکات، ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ بە چاکە دەگۆڕێت].

یانی: کە تاکو ئێستا خراپەیان کردووە لەمەودوا یارمەتییان دەدات چاکە بکەن، یان خودی خراپەکانیان بۆ دەگۆڕی بە چاکە.

کەواتە: ئەوە تەوبە حەقیقەتەکەیەتی، کە مرۆڤ ئەگەر بەڕاستیی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، دەبێ هەوڵبدات هەتا ئێستا چ گوناح و تاوان و لادانێکی کردووە، بیگۆڕێت بە چاکە و

تــاعەت و، شــتێك بكــات كە جێگــای ڕەزامەنــدیی خــوای پەروەردگــار بێت. ئەوە نیشـانەی قبووڵبـوونی تەوبەكەیەتـی، كە ئەو مـرۆڤە وا بگەڕێتەوە بـۆ لای خـوا، هەوڵبـدات ئەوەی پێشـێ قەرەبوو بكـاتەوە، یـانی: نیشـانەی قبووڵبـوونی تەوبەیە، ئەوە كە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ تاعەت و بۆ چاكە، ئنجا ئەگەر وایكـرد، واتە: ئەو تەوبەیەی كە كردوویەتی و ئەو گەڕانەوەیەی قبـووڵە. بەڵام هەرچۆن بێ، مرۆڤ نابێ هەرگیز لە بەزەیی خوا نائومێد بێ، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ یوسف.

واتە: [بێگومــان لە بەزەیــی خــوا (لە دەرووی خێــری خــوا) نائومێد نابن، جگە لە كەسانێك كە بێبڕوان].

چونكە كەسێك ئیمـانی بە خـوا بـێ و خـوا بناسـێ، دەزانـێ بەزەیـی خـوا چەنـد فـراوانە و، هەرگیـز لە بەزەیـی خـوا نائومێـد نابێ.

ئەمەش پوختەیەك لە قسەی ئەمشەومان بوو.

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه اجمعين،
والحمد الله رب العالمين




## تەزكییەی نەفس

**شەریف:** كاتێك مرۆڤ تەوبە دەكات و دەستدەكات بە خواپەرستیی و پەیمان تازە دەكاتەوە، ئەوەی پێویستیەتی تەزكییەی نەفسە. ئەگەر تەوبە و خواپەرستیی كۆشكێك بێ، تەزكییەی نەفس شوورەو قەڵغانە، دەیپارێزێ و ناهێڵێ ڕیایی و كرچ و كاڵیی دزە بكات نێوی، یان لێناگەڕێ تەوبەكە ساردیی تێبكەوێ و بشكێ، ئەگەر خواپەرستیی باخێك بێ، تەزكییەی نەفس باخەوانە و باخەكە بە خاوێنی ڕادەگرێ. وەك چۆن باخ بەبێ باخەوان دەبێتە دارستان و دەعبای دەچنە نێو، ڕووح و خواپەرستیش بەبێ تەزكییەی نەفس، دەبنە شوێنی دەعبا و نەخۆشیی و دەردان.

بابە گیان! پێم خۆشە بۆم باسی ئەوە بكەی، تەزكییەی نەفس چییەو چۆن دەكرێ؟

بــابــم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

ئەمشەو تۆزێك بۆت باسی تەزكییەی نەفس دەكەم. بۆخۆت ئاگاداری من دوو كتێبی تایبەتم لەو بارەوە نووسیون، تا ئێستا یەكەمیان: (ڕێگای ساڵح بوون بەرە و خوا چوون)، ئەوی دیكەشیان (گیانی ژیان)، هەڵبەتە لە مەوسووعە عەرەبییەكەشمدا هەر باسی تەزكیەی نەفسم كردووە و لە هەندێك كتێب و بەرهەمی دیكەشدا باسم كردووە، مەبەستم ئەوەیە كە باسی تەزكییەی نەفس باسێكی زۆر دوورو و درێژ و بە لق و پۆپە، بەڵام هەوڵ دەدەم لە پێنج شەش دەقەیەكدا هەندێك شتی زۆر پوخت و گوشراوت بۆ باس بكەم:

**١-** مانای تەزكییە: جارێ وشەی تەزكییە لەسەر كێشی (تفعیل)ە، (زَكّاهُ يُزَكِّي تَزْكِيَة)، وشەی (زكا يزكو الزرع) واتە: كشتوكاڵەكە پاك بوو، یان گەشەی كرد، یاخود چاك بوو، واتە: وشەی (زكا) سێ مانای هەن:

**أ.** پاك بوون.

**ب.** گەشەكردن.

**ج.** چاك بوون.

کەواتە: تەزکییەی نەفس یانی: ئەوە کە مرۆڤ هەڵسێ بە خۆپاککردنەوە لە سیفەتە نزم و پەستەکان و گەشەپێدانی خۆی، گەشەپێدانی سیفەتی چاك لە خۆیدا و خۆچاککردن و بەرەو پێش بردن.

**٢-** حوکمی تەزکییەی نەفس: تەزکییە لەسەر هەموو مرۆڤێك فەرزە، چونکە خوا (سبحانه وتعالی) سەرفرازیی دونیا و دوارۆژی بە خۆپاك و چاك کردنەوە بەستۆتەوە، واتە: تەزکییەی نەفس، دەتوانین بەکوردیی بڵێین خۆپاك و چاککردن، ئەوە لە زۆر شوێنی قورئاندا خوای بەرزو مەزن باسی کردووە، بۆ وێنە:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩﴾ الشمس.

واتە: [بەڕاستیی سەرفرازە ئەو کەسەی نەفسی خۆی پاك و چاك کردووە].

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤﴾ الأعلى.

واتە: [بەڕاستیی سەرفراز و بەختەوەر و بەمراد گەشتوویە ئەو کەسەی خۆی پاك و چاك دەکات].

ئنجا خۆ پاك و چاککردن بەکردەوە، خوای پەروەردگار کردوویەتی بەهۆکاری سەرفرازیی و دەربازبوون و سەربەرزیی

دونیا و قیامەت، بەڵام خۆ بەپاك و چاك نیشاندان بە قسە، خوا ڕێگریی لێکردووە، دەفەرمووێ:

﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ النجم: ٣٢.

واتە: [بە قسە خۆتان پاك و چاك نیشان مەدەن].

﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ النجم.

واتە: [خوا زاناترە بەو کەسەی کە پارێزی کردووە].

کەواتە: لەڕێی تەقواوە نەفس تەزکییە دەبێت وەك لە سوورەتی (شمس)یشدا خوا دەفەرمووێ:

﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠﴾ الشمس.

واتە: [سوێند بە نەفس و بەوەی کە نەفسی دروستکردووە (یان ڕێك و پێکی کردووە)، ﴿فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨﴾ [ئنجا فێری کردووە کە بە گوناح و بە تەقوا ئاشنابێت (بزانێت پارێزکاریی چۆنە و هەم گوناحکردن چۆنە)].

نەفسی بەشەر دەزانێت تەقواش چییە و دەشزانێت تاوانیش چییە، یاخود دەتوانێت تەقواش لەخۆیدا بێنێتە دی و دەشتوانێت تاوانباریی لەخۆیدا بێنێتە جێ، بەڵام ئەو کەسەی خۆی پاك و

چاك دەكات سەرفرازە، بە پێچەوانەوەش: كەسێك كە خۆی وەبن چڵك و چەپەری گوناحان دەدا، پەشێمان و بەدبەختە و ڕەنج بەخەسارە، دیارە بەبێ هەوڵدان، نە تەزكییەی نەفس و نە هیچ كارێكی دی ئینسان بۆی ناكرێ.

**٣-** شتێك لە ئەزموونی خۆم لەو بوارەدا: ئەگەر لە ئەزموونی خۆم بۆت باس بكەم: كە كاتی خۆی لە سلێمانی دەمخوێند لە دووی ناوەندییەوە چوومە سلێمانی ئەوكات تەمەنم ١٥-١٦ ساڵ بوو، لە (٧٦) تاكو ساڵی (٨٠)ی زایینیی لەوێ بووم. خوای پەروەردگار لوتفی لەگەڵ كردبووم، زۆر لەگەڵ خۆمدا خەریك دەبووم، بەو واتایەی كە هەم بە شێوەی فیكریی و عیلمیی بزانم دینداریی چۆنە و مسوڵمانیی چۆنە؟ هەم بەشێوەی پڕاكتیكیی (تطبيقي)یش خەریك دەبووم هەرچی زانیبام لە خوا نزیكم دەخاتەوە لە شەونوێژ، نوێژی سوننەت، لە ڕۆژی سوننەت، لە قورئان خوێندن، لە زیكركردن، لە خۆپاراستن لە گوناحان، بەپێی توانا، دەمكرد، بەڵكو جاری وابووە ڕەنگە زێدەڕۆیشم تێدا كردبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە خۆم ماندوو دەكرد و لەو كاتەدا ئەوەندە حاڵیی بووبووم، دەتوانم ئەوە بڵێم: ئەو پێنج ساڵەی لە سلێمانی خوێندوومە، یەكجار بە حەڕامیی و بە ئارەزووەوە تەماشای ئافرەتێكم نەكردووە، كە لە تافی لاویەتیدابووم.

**٤-** ئەنجام و بەرهەمی تەزکییەی نەفس:

**یەکەم:** تاعەتت لەلا خۆشەویست دەبێ و تامی لێدەکەی.

**دووەم:** تاعەتت لەلا ئاسان دەبێ و فەرمان بەرییت لا ئاسان دەبێ، بەقالب سووکیی دەیکەی، بەئارەزووەوە دەیکەی، بە شەوق و بە تامەزرۆییەوە دەیکەی.

**سێیەم:** ئیمانەکەت تەڕ و تازە دەبێتەوە، ئیمانت دامەزراوتر دەبێ.

**چوارەم:** خۆت کۆنترۆڵ دەکەی، غەریزەکانی خۆت، ئەندامەکانی خۆت، چ ئەندامە ڕواڵەتییەکان وەك گەدە و داوێن و چاو و زمان و دەست و لاق و گوێ و ئەوانە، چ ئەندامە دەروونییەکان وەك عەقڵ و دڵ و خەیاڵ، کۆنترۆڵیان دەکەی، ئەوە نییە کە بەریان بۆ بەرەڵابکەی، هەرچیان پێخۆش بوو، وابکەن.

**پێنجەم:** هەروەها لە ئەنجامی تەزکییەی نەفسدا، ڕەوشتی ئینسان جوان دەبێ و دەتوانێت بەئاسانیی دەستی لە ڕەوشتە جوانەکانی گیر بێ و خۆی لە خووە خراپەکان بژار بکات، بە ئاسانیی ئەوە دەتوانێت ئەگەر نەفسەکە تەزکییە بووبێ و تەقوای تێدابێت و هەستکردن بە چاودێریی خوای پەروەردگار تێدابێت، ئینسان ئاسانتر خۆی پێ کۆنترۆڵ دەکرێ و خۆی بۆ

دەپارێزرێت لە لادان و تاوانی گەورە و گچکە.

**شەشەم:** مرۆڤ چێژ لە قورئان دەکات، تامی لێدەکا لە قورئان خوێندن و کارلێکی لەگەڵدا دەکا.

**حەوتەم:** بەرهەمێکی دیکە ئەوەیە کاتێك ژیانی پێغەمبەر دەخوێنیەوە (علیه الصلاة وسلام) خۆزگە بەو هاوەڵانە دەخوازی کە لە خزمەتی دابوون.

**هەشتەم:** یەکی دیکە لە نیشانەکانی تەزکییە بوون و پاك و چاك بوونی نەفس و بەرهەمەکانی ئەوەیە کە ئینسان زۆر جار خەڵوە (اعتکاف) و تەنیایی پێخۆش دەبێ. ئەوەی نەفسەکەی تەزکییە نەبووبێت، دوو سێ سەعاتان لە ژووری بێ دڵی توند و سەغڵەت دەبێ، بەڵام ئەگەر تۆزێك نەفسەکەی تەزکییە بووبێ، لە شەو بێ یان لە ڕۆژ، پێی خۆشە لە خەڵوەت دابێت، لە خزمەت خوای پاك و تاکدا ڕاز و نیاز دەکات و دەپاڕێتەوە، قورئان دەخوێنێ، تاعەت دەکا، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگاری لە خەڵکی خۆشتر دەوێ، کاتێك کە بە تەنهایە و کەسی لەلا نییە، هەست بە دڵ سەغڵەتیی ناکات، چونکە دەزانێت کە لە خزمەت خوای پەروەردگار دایە.

ئەوەش کورتەیەك بوو لەبارەی تەزکییەی نەفسەوە. خوا تەوفیقمان بدات زیاتر ئاگامان لەخۆمان بێت و، نەفسی خۆمان

پاك و چاك بكەین، ئەوەش بزانە كە ئینسان ئەگەر نەفسەكەی تەزكییە بوو بێت، زۆر باكی بە مەدح و زەمی خەڵك نییە، خەڵك چی دەڵێ! هیچ شتێك لەبەر ئەوە ناكات داخۆ خەڵك چ دەڵێ! نە هیچ شتێكیش واز لێدێنێ لەبەر ئەوەی نەوەك لێی ببێتە ڕیا، نە هیچ شتێكیش دەكات بۆ سەرنج ڕاكێشانی خەڵك، ئەسڵەن خەڵكی لەبەرامبەر خوادا بە نەبوو دادەنێت، واتە: سەرنجیان نادات داخۆ لێی ڕازی دەبن، یان ناڕازیی دەبن، مەدحی دەكەن یان زەمی دەكەن؟! چونكە دەزانێت كە بە تەنیا خوا دەتوانێت بەرزی بكات یان نزمی بكات، بە هۆی تاعەتەوە مرۆڤ بەرز دەبێتەوە و، بە هۆی گوناحەوە نزم دەبێتەوە. بەڵام ڕازیی بوون و ڕازیی نەبوونی خەڵك، شتێك لە قەزیەكە ناگۆڕێت، ئنجا ئەگەر ئینسان ئەو ئیمانەی لە دڵدا هەبوو، ئەوكاتە دەربەستی ئەوە نابێت خەڵك چی دەڵێ؟ كەسی وا هەیە كە كلكە جەریدەیەك، كەسێك شتێكی لەسەر دەنووسێت، سەری دونیایەی لێ دێتەوە یەك، بەڵام ئەگەر تۆ بەڕاستیی هەست بە نزیكیی و دۆستایەتیی بكەی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، دەزانی كە ئەگەر خوا بەرزت بكات، بە كەس ناشكێی و ئەگەر خواش بتشكێنێ، بە هیچ كەس بەرز نابیەوە.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين
والحمد لله رب العالمين




## ئیمان، چۆن کەم دەبێ و بەچی زیاد دەکات؟

**شەریف:** وەك تێیگەیشتووم، ئیمان ڕووحی خواپەرستییە، بەبێ ئیمانێکی تۆکمە، مرۆڤی مسوڵمان نە چێژ لە خواپەرستیی وەردەگرێ، نە قەت دڵیشی ئاسوودە دەبێ. ئیمانە مرۆڤێکی دڕندە و بێ هەست دەکات بە مسوڵمانێکی دڵنەرم و بەبەزەیی، ئیمان تاکە سەرچاوەیە لە تەواوی گەردووندا بتوانێ بە کەمترین ماوە تەواوی کەسایەتیی کەسێك و سروشتی کۆمەڵگایەك بگۆڕێ.

بابە گیان! ئەمشەوی ڕەمەزان لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانم بەیەکەوە کۆبووینەتەوە، تازە تەراویحمان تەواوکرد، پێم خۆشە بۆمان باسبکەی، ئیمان بەچی کەم دەکا و چۆن زیاد دەبێ؟

بـابــم:

کاك شەریف و پۆلێك لە هاوەڵەکانی!
السلام علیکم ورحمة الله،

ئەمشــەو (٢٦)ی مــانگی ڕەمــەزانی ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچییە بەرامبەر ١٩/١٨ی مانگی پێنجی ساڵی (٢٠٢٠)ی زایینیی، دەمەوێ لەو بارەوە بۆتان بدوێم، چۆن پارێزگاریی لە ئیمـان و عەقیـدەی خۆیـان بکـەن، نـەك تـەنها پارێزگـاریی لێکردنی، بەڵکو چۆنیش دەتوانن ئیمانی خۆتان بەهێزتر بکەن و خواپەرستیی خۆتـان چـاکتر بکـەن و، تـەقوای خۆتـان زۆرتـر بکـەن، لـەو بـارەوە بۆتـان دەدوێم. بێگومـان قسـەکـانم زۆر بـە گوشـراویی و بـە کـورتیی دەکـەم، ئەگەرنـا هـەر کامێـك لـەو بابەتانەی ئامـاژەم پێیانـدا، دەبێ چەندان وتار و بەڵکو چەندان کتێبـی لەسـەر بنووسـرێن، بـەڵام زۆر بەگوشـراویی قسـەکـانم دەکەم.

بێگومان دەستمایەی ئینسان لە ژیانی دونیایدا، بریتییە لە ئیمان، واتە: وەك چۆن کەسێك بیەوێت مامەڵەیەك، بازرگانییەك بکات، ئەگەر پارەیەکی بەدەستەوە نەبێت و سەرمایەیەکی نەبێت، ناتوانێت کەسابەت و بازرگانیی بکات، ناتوانێ مامەڵە بکات و بە گیرفانی خاڵیی شت سەوداکردن، هەر عەیبداریی

لەدوایە، کەسێك دەچێت شتێك سەودا دەکات و دەیهێنێتە سەر کڕین، کە دەست دەکاتە گیرفانی هیچی لە نێودا نییە ناتوانێ بیکڕێ و تەریق دەبێتەوە، بەهەمان شێوەش دەستمایەی دەستی ئینسان لە ژیانی دونیایدا کە بتوانێت بەندایەتیی بۆ خوا پێ بکات، بریتییە لە ئیمان، بە ئەندازەی ئەوە کە ئیمانمان هەیە، بەندایەتییمان بۆ خوا پێدەکرێت. بە ئەندازەی ئەوەی کە ئیمانمان هەیە، واتە: خوا دەناسین و بڕوامان پێیەتی و بڕواشمان بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە خوا پێویستیکردووە ئیمانیان پێبهێنین، لە کتێبەکانی، لە فریشتەکانی، لە پێغەمبەرانی، لە ڕۆژی دوایی و، لە هەموو ئەو شتانەی کە خوای بێ وێنە بە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناردوونی. کەواتە: لە دونیادا بەبێ ئیمان، ئینسان ناتوانێ خوا پەرست بێ، ناتوانێ مسوڵمان بێ و دینداریی بکات. بۆیە هەموو دواندنەکانی خوا بۆ مسوڵمانان بە ناو و نیشانی ئیمانن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ واتە: [ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە]. مرۆڤ ئەگەر ئیمانی نەبێ، شایستەی ئەوە نییە خوا بیدوێنێ. بۆیە ئیمان ناو و نیشانێکە هەموو شانازییەکی تێدایە بۆ ئینسان، چونکە بەهۆی ئیمانەوە ئینسان شایستەی ئەوە دەبێ خوا بیدوێنێ و ئەرکی پێبسپێرێ و، پێی بفەرمووێ: ئاوابکە، بۆ تۆ باشەو، ئاوامەکە، بۆ تۆ خراپە. هەربۆیەش لە هەموو قورئانی مەککەییدا خوای

بەرز یەکجاریش نەیفەرمووە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ بەڵکو دەفەرمووێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ یان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ﴾ یان ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ چونکە لەوێ مسوڵمانان کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکیان نەبوو ناو و نیشانێکیان لەسەربێ، وەك ئیمان بەڵکو لەوێ تاکتاکی مرۆڤەکان ئیمانیان هەبوو، بۆیە خوای تاك و پاك وەك ئینسان دواندوونی، بۆ وێنە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ٦﴾ الانفطار، یان: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ البقرة.

بەڵام دوای ئەوەی مسوڵمانان قۆناغی مەکەییان هەڵبوارد و چوونە مەدینە، لەوێ کۆمەڵگای ئیمانداران دروست بوو، ئنجا بەهۆی ئەو ئیمانەوەش، ئەو کۆمەڵە، خەڵکە شایستەیی ئەوەیان پەیداکرد کە خوا بە تایبەت بیاندوێنێ و ئەرکیان بخاتە سەرشان.

(موحەممەد ئیقباڵی لاهووریی) دەڵێ: "بابم لەسەرەتای تەمەنمەوە ئامۆژگارییەکی کردم، زۆر لێی بەهرەمەند بووم گوتی: ڕۆڵە گیان! هەرکاتێ قورئان دەخوێنیت و خوا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ تۆ وابزانە کە خوا لەگەڵ تۆیەتی و تۆ دەدوێنێ، چونکە خوا دەفەرمووێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! تۆش یەکێکیت لەوانەی ئیمانیان

هێناوە، کەواتە: تۆ پێت وانەبێ خوا لەگەڵ تۆی نییە، بەڵکو ئێستا خوا بەشەخسیی لەگەڵ تۆیەتی، چونکە تۆش یەکێکیت لە ئیمانداران".

ئیمان لە دونیادا وا لەمرۆڤ دەکات کە شایستەی ئەوەبێ خوا بیدوێنێ و حیسابی بۆ بکات و ئەرکی بخاتە سەرشان، پاشان بەهۆی ئیمانەوە مرۆڤ بەرپێی خۆی دەبینێ و بەرچاوی ڕۆشن دەبێ، بەهۆی ئیمانەوە ئینسان دەزانێ کێیە؟ لە کوێوە هاتووە؟ بۆچی دروستبووە؟ دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ بەهۆی ئیمانەوە ئینسان لەلای ڕوون دەبێ: حەڵاڵ چییە، حەڕام چییە، چاکە چییە، خراپە چییە، دۆست کێیە، دوژمن کێیە؟ وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴾ یونس: ٩.

واتە: [ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوە باشەکان دەکەن، خوا بەهۆی ئیمانەکەیانەوە ڕێنماییان دەکات، بەرچاویان ڕۆشن دەکاتەوە، ڕاستەڕێیان دەکات ].

کەواتە: زۆر گرنگە ئێمە ئەو ئیمانە، کە ئەوە گرنگیی و بایەخیەتی، ئاگامان لێبێ، مرۆڤ بەچی دەبێ ئاگای لە ئیمانی خۆی بێت؟ ئیمان بە تاعەت و فەرمانبەریی زیاد

دەکـات و بــە گونـاح و تـاوان کـەم دەکـات. بـۆ وێـنە: خـوای پــەروەردگار لــە قورئانــدا دەفــەرمووێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾ الأنفال: ٢.

واتە: [کاتێك کە ئایەتـەکانی ئێمەیـان بەسـەردا خوێنـدرانەوە، ئیمانیان پێی زیاد بوو].

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئیمان زیاد دەکات و کـەم دەکات.

کەواتە ئیمان بەوە زیاد دەکات کە تۆ زیاتر لە ئایەتـەکانی خــوا تێبگــەی و لەگــەڵیانــدا کارلێــك بکــەی، هــەر وەك بە پـێچەوانەوەش: ئیمـان بـە گوناحـان کـەم دەکـات، وەك حەدیسـی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ:

{لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ}[1].

واتە: (کەسـێ کـە زینـا دەکـات لـە کـاتی زیناکردنـەکـەیدا ئیمانی نییە و، کەسێ کە دزیی دەکات لەکاتی دزیەکەیدا ئیمانی نییە و، کەسێ کە شەڕاب دەخواتەوە لەکاتی شەڕاب خواردنەکەیدا ئیمانی نییە).

١) أخرجه عبد الرزاق: برقم (١٣٦٨٦)، ومسلم برقم (٥٧)، وأبو داود برقم (٤٦٨٩)، والترمذي برقم (٢٦٢٥).

واتــە: ئیمــانێکی نییــە کــە لــەو گوناحانــەی بیگێڕێتــەوە، کەواتــە: بــەهۆی ئــەو گوناحانــەوە ئیمــان کــەم دەکــات، هــەر وەك بــەهۆی تاعەتــەوە ئیمــان زیــاد دەکــات، بۆیــە ئەگــەر بمانــەوێ هەمیشە ئیمانەکەمان گەرم و گوڕ بێت، بەهێز و بە پێز بێ، دەبێ بەردەوام سەرگەرمی تاعەت بین، بە تایبەت لەم مانگی ڕەمەزاندا کە بەڕاستیی هەمیشە لە مانگی ڕەمەزاندا، خوای پەروەردگار بەرەکەتی زۆر بەسەر ئۆممەتدا ڕشتووە.

لە حاڵێکدا کە ئەو کافرستانەی کە دەبینرێ، ئەو دەرد و پەتایە زۆر بە سەختیی لە نێویاندا بڵاو بۆتەوە، هەڵبەتە ئێمە پێمان خۆش نییە هیچ کەسێك لە مرۆڤەکان، لە بەندەکانی خوا، زیان بکات، بەڵام بە تەئکید ئەوانە زۆر قەرزداری ئەهلی ئیسلامن، ئەو زلهێزانە، وڵاتی بەریتانیا، ئێستا نا، بەڵام کاتی خــۆی بــەریتانیا: بــەریتانیای مەزن (بريطانيــا العظمى)یــان پێگوتــووە، کــە (هینــد) بــەو هــەموو زەبەلاحییــەی داگیرکــراو (مستعمرة)ی بەریتانیا بووە. ئنجا ئەوانە ئەو سەروەت و سامانە حەرامــەی وەســەریەکیان نــاوە کــە خێــر و بێــری مســوڵمانانە و بەتاڵان بردوویانە، ئێستا تەماشا دەکەی پارەکەیان لەو پەتا و نەخۆشییە دەدەن، خوای کارزان زیاتر ئەو دەردەی والێکردووە، زیــاتر ڕووی لــە ئــەهلی کــوفرە، ئەوانــەی کــە وەك دڕنــدەیــەك بــەچاوی نێچیــر تەماشــای مســوڵمانان دەکــەن. بــەڵــێ

مسوڵمانانێکی وەك ئێوەش لەوێ حاوانەوە و پەنادراون، ئەوەیش چاکەیەکە دەبێ ئێمە چاکەی خەڵك وەك خۆی ببینین و خراپەکانیشیان ببینین، بەڵام مەبەستم ئەوەیە هەست دەکەم لەم مانگی ڕەمەزانەدا، بەرەکەتێکی زۆر ڕووی لە ئۆممەت کردووە، ئەو ئۆممەتە بێ دەسەڵاتەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لە قورئان و سوننەتەوە، تەبایی نێو خۆیان نەماوە، برایەتیی و یەکڕیزییان نەماوە، هێز و پێزیان نەماوە، کە مسوڵمانان دەبینین: دواکەوتوون لە ڕووی زانستیی، لە ڕووی تەکنۆلۆجیی، لە ڕووی پیشەسازیی، لە ڕووی سیاسیی و ئیداریی و ئابووریی و، لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییانەوە، ئەوە هەمووی ئەنجامی دوورکەوتنەوەیە لە قورئان، کە ئەو هەموو باجانە دەدەن، کاتێ مسوڵمانان دەستیان بە ئیسلامەوە بوو، لە هەموو ڕوویەکەوە لە پێشەوەبوون.

ئەم مانگە بەتایبەتی ئەو چەند شەو و ڕۆژەی ماون، بۆ هەموو کەس دەرفەتێکی باشە، کە ئیمانی خۆی بەهێزتربکات و، بەپێزتر بکا، پەیوەندیی خۆی لەگەڵ خوای میهرەباندا باشتر بکا و، ئینسان هەر بەوەندە ئیمانەش کە هەیەتی، وازنەهێنێ و هەوڵبدا لێی زیاد بکات، ئنجا ئایا ئیمان بەچی لێی زیاد دەبێ؟ بە گشتیی دەتوانین بڵێین: ئیمان بە (عیلم و عەمەل) زیاد دەبێ:

**یەکەم:** (زانیاریی) بە هەر دوو کتێبی خوێندراوە و بینراوی خوا، کتێبی خوێنراوەی خوا (قورئانە) و، کتێبی بینراوی خواش (گەردوونە). ئینسان تاکو زیاتر بە ئایەتەکانی قورئان ئاشنابێت و، هەتا بە دیاردە و دیمەنەکانی گەردوون و بوونەوەر زانیار و شارەزا بێ، هەم دەزانێ خوا چی فەرمووە، بەهۆی قورئانەوە، هەم دەزانێ خوا چی دروست کردووە، بەهۆی شارەزایی لە کتێبی گەردوون و (کون)ەوە، (مەلای گەورەی کۆیە) قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: "عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە، بەخوا نازانی خوا چی دروستکردووە، عیلمی (طبیعة) عیلمی خودایە، (قال) و (قول)ە گشتی هەبایە". وەختی خۆی مامۆستایەکانی کوردەواریی هەر خەریکی (نحو و صرف) و زانیاریی عەرەبیی بوون، بەڵام نەچوون دوایی کە فێری عەرەبیی بوون، زمانەکە بەکار بهێنن بۆ لێتێگەیشتنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بۆیە مامۆستای گەورەی کۆیە مەبەستی یەکێکە لەوانە.

کەواتە: عیلم و شارەزاییەك کە دەبێتە هۆی زیادبوونی ئیمان، ئەوەیە کە هەرچی زیاتر لە کتێبی خوا شارەزابین، دیارە ڕێبازی پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەر بەرجەستەکردن و ڕوونکردنەوەی لایەنی کردەیی کتێبی خوایە، پاشان لە دروستکراوی خواش شارەزا بین، لە گەردوون لە هەموو

ڕووەکانەوە، لە ڕووی فیزیاییەوە، لە ڕووی گەردووناسییەوە، لە ڕووی پزیشکییەوە، لە ڕووی زەوی ناسییەوە، لە ڕووی مێژووییەوە، لە ڕووی هەموو ئەو زانستانەوە کە هەن، لە ڕووی دەروونناسییەوە، کۆمەڵناسیی و...هتد.

ئینسان تاکو زیاتر شارەزابێ لە دروستکراوەکانی خوا، زیاتر حیکمەتی خوا و زانیاریی و شارەزایی خوای بۆ دەردەکەوێ. دیسان تاکو زیاتر لە فەرمایشتی خوا ئاگادار بێ، زیاتر دەزانێ خوای پەروەردگار چەند حەکیمانە و چەند زانایانە فەرمایشتی فەرمووە! هەروەها ئەو ئایین و شەریعەت و وەحییەی ناردوویەتی، چ بەرەکەت و پیزێکی گەورەی تێدایە!

**دووەم:** هۆکاری زیادبوونی ئیمانە، بریتیە لە کردەوە (عمل). ئینسان هەرچەندە زانیاریی زۆر بێ، بەڵام ئەگەر بەپێی زانیارییەکەی بەڕێوە نەچێ و کردەوەی پێ نەکات، زانیارییەکەی لەسەری دەبێتە بەڵگە، لەجیاتی ئەوەی بۆی ببێتە بەڵگە. لە ڕاستییدا زانیاریی وەسیلەیە و ئامانج بریتییە لە کردەوە، بە کردەوە ئینسان لە خوا نزیك دەبێتەوە، بەڵام دیارە زانیاریی مایەی بەرچاو ڕوونکردنەوەیەتی، چونکە بەبێ زانیاریی ئینسان نازانێ چۆن هەنگاو بنێ، بەبێ زانیاریی نازانێ چۆن خوا بپەرستێ؟ تۆ ئەگەر شارەزا نەبی، بۆ نموونە: ڕۆژووگرتن دەبێ بزانی لە ڕووی شارەزایی شەرعییەوە،

ڕۆژووگرتن چۆن دەبێ؟ یان نوێژکردن، دەبێ بزانی مامەڵەکردن و کاسبیی کردن، هەروەها هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ لە ڕووی عیلمییەوە، لە ڕووی شەرعییەوە بزانی چۆنە؟ ئەوجار دەتوانی بەشێوەیەکی دروست مامەڵە بکەی، ئەگەرنا لە ئەسڵدا زانیاریی وەسیلەیە بۆ کردەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتی هەموو لایەکتان بدات: هەرچی زیاتر زانا و بەرچاوڕوون و شارەزا بن، هەم لە شەریعەت و بەرنامەی خوای پەروەردگاردا، هەم لە دروستکراوەکانی خوای بەخشەردا. خواش تەوفیقتان بدات کە ئەوەی دەیزانن بیتوانن و حاڵیبوونەکە لەخۆتاندا بکەنە حاڵ و زانیارییەکەتان بگۆڕن بۆ توانین، بۆ ئەوەی هەرچی زیاترە ئیمانەکەتان بەهێز و پێزبێ و گەرم و گوڕبێ، بە تایبەت لەو وڵاتەی کە ئێوە لێی هەن، ئەگەر بێت و لەزاتی خۆتاندا پارێزبەندیی (حصانة) و بەرگرییەکیی بەهێزتان نەبێ، لە ڕاستییدا لەوێ جەوێك هەیە کە گوناحکردن ئاسانترە و کارتێکارە خراپەکان بۆ تاوان و لادان زیاترن، بەڵام ئینسان ئەگەر ئیمانێکی باشی هەبوو لەجیاتی ئەوەی بکەوێتە ژێر کاریگەرییە خراپەکان، بەپێچەوانەوە ئەو کاریگەریی چاکی دەبێ بۆسەر دەورووبەری خۆی. وەك کاك شەریف وەبیری دێ،

هەموو جارێ بە منداڵەکانی خۆم دەڵێم: ڕۆڵە! ئێوە موگناتیس بن خەڵك ڕاکێشن بۆ چاکە، ئاسن و بزمار مەبن خەڵك ڕاتان کێشێ بۆ خراپە، ئێوە خەڵك پەلکێشی چاکە بکەن، نەك خەڵك ئێوە پەلکێش بکەن بەرەو خراپە و تاوان و لادان.

دووبارە سڵاو ڕێزم هەیە بۆ خۆت و هاوەڵەکانت کە پێکەوەن، خوای پەروەردگار بتانپارێزێ و تاعەتی مانگی ڕەمەزانتان قبووڵ بکات، خوا پشتیوان بێ ئەو قسانەی بۆمکردن کەلێنێکی بۆ گرتوون و سوودێکتان لێوەرگرتووە.

والسلام عليكم ورحمة الله




## خوێندنەوە

شـــەریف: لەم ســـەردەمەی ئێســـتا، لە زۆربەی چینەکـــانی کۆمەڵگادا، خوێندنەوە زۆر کاڵ بۆتەوە و لەلای زۆربەی خەڵکـی تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکـان و بەزمـوڕەزمی ڕۆژانە جێـی خوێنـدنەوەیان گرتـۆتەوە. وەك گـوتراوە: خراپتـر لە سوتاندنی کتێبەکان، نەخوێندنەوەیانە، زانایان دەڵێن: زیاتر ئەو زانیارییانەی لە کتێبەکاندا هەن لە مێشکی مرۆڤدا بۆ ماوەی درێژ دەمێننەوە، دونیا لەوەی ئێستا هەیە زیاتر پـێش دەکەوێ، بەڵام هـیچ شـتێك جێگـای خوێنـدنەوەی کتێـب نـاگرێتەوە، بـۆ وێـنە: زانیـاریی خێـرای سـەر ئینتەرنێت وەك خـواردنی خێـرا، زوو تێـرت دەکـا و زووش برسـیت دەبێـتەوە و دەڕوا، ئەوەی سـەیرە لەم سـەردەمەدا کەسـانێکی زۆر ڕەخـنە لە هەمـوو شـتێك دەگـرن و لە هیچـی واش نـازانن، یـان دەربـارەی هەمـوو شـتێك قسـە

دەکەن و زانیارییەکەشیان زۆر سنووردارە، ئەمانە نیشانەی کەسانێکن کە ناخوێننەوە، مرۆڤ کە خوێندنەوەی ڕۆژانەی هەبوو، بەردەوام سڵ دەکاتەوە، زۆر بە وریاییەوە قسە دەکات، زۆر بەڕێوجێ ڕەخنە دەگرێ، چونکە ئەدەب و یاساکانی خوێندنەوە و قسەکردن و گوێگرتن و ڕەخنەگرتن دەزانێ.

بابە گیان! پێم خۆشە بۆم باسی گرنگیی خوێندنەوە و چۆنیەتیی خوێندنەوە بکەی.

بابم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

باشە کاك شەریفی کوڕم!

ئەمشەو بۆت باسی خوێندنەوە، گرینگی خوێندنەوە و چۆنیەتی خوێندنەوە دەکەم. گومانی تێدا نییە ئێمە کە خوا لەسەر زەوی داینـاوین، بەبێ ئەوەی کە بەردەوام خەریکی خۆتێگەیاندن و خۆپێگەیاندن بین، ناتوانین مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ دەوروبەرماندا بکەین، کاتێك مرۆڤ دەتوانێ مامەڵەیەکی ڕاست لەگەڵ ژینگەدا، لەگەڵ دەوروبەردا،

لەگەڵ کۆمەڵگادا بکات، کە ئەو ژینگە و دەوروبەر و کۆمەڵگایە باش بناسێ.

هەر بۆیە زانایانی پێشوومان (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) وێڕای ئەوەی کە لە دیندا شارەزابوون، لە ژینیشدا شارەزا بوون. وێڕای ئەوەی کە خوای پەروەردگاریان ناسیوە، ئاشنا و شارەزای خەڵك و بارودۆخی خەڵك و کەلتوور و فیکر و فەرهەنگ و عادەت و نەریت و هەڵسوکەوتەکانی خەڵکیش بوون.

ئنجا ڕێگای گرنگ بۆ شارەزابوون و ئاشنابوونی مرۆڤ بە دەوروبەری، بە خەڵك، بە کۆمەڵگا، بە خێر و شەڕی خەڵك، بریتییە لە خوێندنەوە — کە بەداخەوە ئێستا زۆر کەم بووە بە تایبەت لە وڵاتانی مسوڵماننشیندا.

تۆ ئێستا لە (بەریتانیا)ی تەماشا دەکەی، لەگەڵ ئەوەدا کە تەکنۆلۆجیای مەعلووماتیی و سۆشیال میدیا، زۆر برەوی ستاندووە، بەڵام ئێستاش لەگەڵدا بێ کتێب جێی خۆی هەر هەیە، خەڵك سواری تەیارە، شەمەندەفەر، پاپۆڕ و بەلەم و، سەیارە دەبێ، یان لە باخێکی گشتییدا دادەنیشێ، مەگەر چۆن دەنا کتێبێکی هەر پێیە.

ئنجا من ئامۆژگاریی تۆ بەوە دەکەم هەمیشە هەوڵبدە باشترین و نزیکترین هاوڕێت کتێب بێ، هەروەها بە گشتیی،

مـرۆڤ دەبێ کـاتی خۆی بەفیـڕۆ نەدات، جگە لەو کاتـانەی مـرۆڤ بیـر دەکـاتەوە، چـونکە بەبـێ بیرکـردنەوە، مـرۆڤ لە خوێندنەوەش بەهرەمەند نابێ، جگە لەو کاتـانەی بیـر دەکەیەوە، هەوڵبدە بخوێنەوە.

جیـــاوازیی نێـــوان مســـوڵمانانێك کە ئێســـتا لە ڕووی دونیادارییەوە دواکەوتوون، لەگەڵ نامسـوڵمانانێکدا کە لە ڕووی دونیـــادارییەوە پێشـــکەوتوون، ئەوەیە کە مســـوڵمانان کەمتـــر دەخوێننەوە، کەمتر شارەزان و کـاتی خۆیـان زۆر بەفیـڕۆ دەدەن. وەك چۆن جەستە بە تێرکردنی غەریزەکان ئارام دەگرێ. مـرۆڤ کە برسی دەبێ، بە خواردن خواردنەوە ئارام دەگرێ، یان تینـووی بــێ، بە ئـــاوخواردنەوە تینـــوویەتیی دەشـــکێ. ئەوە لە ڕووی جەستەییەوە، لە ڕووی ڕووحیشەوە، خوای پەروەردگار یەك ڕێبـاز و شـــێوازی بـــۆ ئـــێمە دانـــاوە، بـــۆ ئـــۆخژنی دڵ و دەروون، دەفەرمووێ:

﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ الرعد.

واتە: [ئاگاداربن! بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن].

وەك چـۆن جەســتە خـۆراك و پێداویســتیی هەیە، ڕووحــیش پێداویسـتیی و خـۆراکی خـۆی هەیە کە بـریتییە لە پەیوەنـدیی هەبوون لەگەڵ خوادا.

مەبەستیش لە یادی خوا تەنیا ئەوە نییە دابنیشی (سبحان الله والحمد الله) بکەی، یادی خوا یانی: پەیوەندیی لەگەڵ خوا، بەندایەتیی بۆ خوا، فەرمانبەریی بۆ خوا، نزیکیی لە خواوە (سبحانە وتعالی).

ئنجا ئەوە هەم لە یادکردنەوەی زمانیی، هەم لە یادکردنەوەی جەستەیی و تاعەت بەرجەستە دەبیَ، هەم لە ئۆخژن و ئارامیی دڵ و دەروونیدا، هەم لە خۆپاراستن لە گوناح و قەدەغەکاندا، لە هەموو ئەوانەدا، بەرجەستە دەبیَ.

کەواتە: جەستە بەو شتانە ئۆخژن و ئارامیی بۆ دیَ، کە لەو شوێنەوە هاتوون کە جەستەی لیَ هاتووە، کە بریتییە لە زەوی و خاك، ڕووحیش، بەو شتانە ئۆخژن و ئارامیی بۆ دیَ، کە لەو سەرچاوەی کە لێوەی هاتووە پەیدادەبن، کە بریتییە لە پەیوەندیی هەبوون لەگەڵ خوادا، ڕووح شتێکی خواییە، خوا دەفەرمووێ:

﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ الحجر: ٢٩.

واتە: [لە ڕووحێکی (کە دروستکراوی خۆمە) فووم بەبەرد کردووە].

ڕووح بە تایبەتی لەلایەن خواوە هاتووە و لە زەویەوە پەیدا نەبووە.

کەواتە:

شەریف گیان!

هەتا بۆت دەکرێ لە کات و تەمەنی خۆت بەهرەمەندبە و - وەك بابت- هەوڵبدە نەك ڕۆژ و سەعات، بگرە خولەك و چرکەکانیشت بە فیڕۆنەدەی و بەردەوام سەرگەرمی تێگەیشتن و پێگەیشتنی زیاتربە. بەهۆی خزمەتکردنی عەقڵ و هۆشتەوە، پێدانی زانیاریی و شارەزایی زیاتر و باشتر، کە خوێندنەوە و موتالا ڕێیە ئاچووخ و سەرکییەکەتە و، خزمەتکردنی دڵت بە یادی خواو لە خوا نزیکییەوە و، دڵنیاش بە، بە ئەندازەی نزیکییمان لە خواوە، لە هەموو خێر و چاکەیەك نزیکین، لە هەموو شەڕ و خراپەیەکیش دوور دەبین.




## وەسوەسە و گومان

شەریف: هەر لەگەڵ درووستبوونی مرۆڤەوە، وەسوەسە و گومان هەبووە و دەبێ. چۆنیەتیی کاردانەوە بۆ ئەو گومان و وەسوەسەیە، گرنگە و جێی بایەخە، جاری وایە وەسوەسەت بە دڵدا دێ، دەربارەی خوای پەروەردگار، یان ئەو خواپەرستییەی دەیکەی قبووڵ نەبێ، یان گومانی خراپ دەخزێتە نێو مێشکت، دەربارەی ژیان و ئەو شتانەی سەرقاڵی کردنیانی، یان زۆر کەس بەردەوام وەسوەسەیان هەیە لە خواردن و خاوێنیی، یان لە خزم و کەسوکاریان بەگومانن، وەسوەسە و گومان وەك حیکایەتی مێشێ وان، تا زیاتر بەدوایدا بڕۆی، زیاتر درێژە دەکێشێ، کۆتایی نییە، دەبێ تۆ کۆتایی پێبێنی، وەسوەسە و گومان پێچەوانەی دڵنیایی و یەقینن، باشترین دڵنیایی و یەقینیش خوای پەروەردگار و کتێبە بەپیزەکەیەتی، خۆشارەزاکردن لە قورئان و زۆر یادی خواکردن، باشترین

هۆکارن بۆ ڕەواندنەوەی هەر گومان و وەسوەسەیەك.
پرسیارم لە بابم کرد:
بابە گیان! چۆن مرۆڤ بتوانێ بۆ هەمیشە لە وەسوەسە و گومانی خراپ ڕزگاری بێ؟

بابم:
بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

هیچ ئینسانێك لە خوتخوتە و خەیاڵی خراپ کە پێی ناخۆش بێ پارێزراو نییە. هەر بۆیە خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەموویێت:

﴿لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾ البقرة.

واتە: [هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی هی خوایە، ئنجا ئەوەی کە لە دڵتاندایە ئاشکرایبکەن یان پەنهانی بکەن، خوا لەسەری لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات...].

کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار، وەك لە (صحیح البخاریی)دا هاتووە هاوەڵان چوونە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! تاکو ئێستا ئەوەی بۆت دابەزیوە بۆمان جێبەجێکراوە، بەڵام ئەوەمان بۆ جێبەجێ ناکرێ! خوای بەبەزەیی دەفەرمووێت: هەرچی خوتخوتە و خەیاڵی خراپە، لێپرسینەوەی لەسەرە؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: دەتانەوێ وەك خاوەن کتێبەکان (جوولەکە و نەسرانییەکان) بڵێن: (سمعنا وعصينا) بیستمان و سەرپێچیی دەکەین؟! ئەوان وا تێگەیشتبوون کە هەر خەیاڵ و خوتخوتەیەك بە دڵتدا دێ، هی خراپ، ئنجا دەربارەی خوای پەروەردگار بێ، دەربارەی پێغەمبەر بێ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، دەربارەی حوکمێکی ئیسلامیی بێ، یان دەربارەی نیاز و مەبەستێکی خراپ بێ، کە گوناحێك و تاوانێك بێ، وایانزانی: هەرچی بە دڵتدا دێ، لێپێچینەوە و سزای لەسەرە، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە ئاوای پێ فەرموون، ئەوانیش گوتیان ئێمە ملکەچین بۆ خوا، دوای ئەوە خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (البقرة)دا ئایەتی (٢٨٥)ی دابەزاند کە دەفەرمووێ:

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا

﴿وَأَطَعۡنَا﴾ البقرة.

واتە: [پێغەمبەر بڕوای هێنا بەوەی کە بۆی دابەزێنراوە لە پەروەردگارییەوە، هەروەها بڕوادارانیش بەهەمان شێوە، هەموویان بڕوایان هێنا بە خوا و فریشتەکان و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەران، (گوتیان:) جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەران و گوتیان: بیستمان و فەرمانبەرین].

﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾ البقرة.

واتە: [داوای لێبوردن دەکەین پەروەردگارمان و، سەرەنجام هەر بۆلای تۆ دەگەڕێینەوە].

دوای ئەوەی ئەو ئایەتەیان خوێندەوە و لە دڵیاندا چەسپی، ئنجا خوای پەروەردگار ئایەتی (٢٨٦)ی سووڕەتی (البقرة)ی دابەزاند، کە دەفەرمووێت:

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ البقرة.

واتە: [خوای پەروەردگار هیچ کەسێك ئەرکدار ناکات، مەگەر بەوەی کە لە توانایدا هەیە].

مرۆڤ لەتوانایدا نییە وەسوەسەی خراپی بەدڵدا نەیەت، بەڵام لە توانایدا هەیە ئەو وەسوەسە خراپە لە دڵی خۆیدا نەچەسپێنێ،

کەواتە: ئەوەی بەدڵتدا دێ و دەڕوا، لێپرسینەوەی لەسەر نییە چونکە لەتواناتدا نییە[١].

ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی هاتنە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە هەڵە تێگەیشتبوون، وایان زانیبوو هەرچی بەدڵتدا دێ، لە شتی خراپ، هەموو لێپرسینەوەی لەسەرە، بەڵام دواتر

١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) قَالَ فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ، فَقَالُوا: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، كُلِّفْنَا مِنْ الْأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ الصَّلَاةَ وَالصِّيَامَ وَالْجِهَادَ وَالصَّدَقَةَ، وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هَذِهِ الْآيَةُ وَلَا نُطِيقُهَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا بَلْ قُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِي إِثْرِهَا آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللَّهُ تَعَالَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا قَالَ نَعَمْ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ قَالَ نَعَمْ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ قَالَ نَعَمْ} صحيح مسلم: (١٢٥).

خوای پەروەردگار لەو دوو ئایەتەدا ڕوونی کردەوە، کە وانییە و تیشکی خستە سەر بابەتەکە:

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ البقرة.

واتە: [بەدەر لە توانا، خوا تەکلیف ناخاتە سەر هیچ کەسێك، هەر کەسێك کارێکی باشی ئەنجامدا، پاداشت و خێرەکەی بۆ خۆی دەبێ و هەر خراپەیەکیشی کرد، بەزیانی خۆیەتی و یەخەی خۆی دەگرێ و لەسەری سزا دەدرێ].

بۆ چاکەکە دەفەرمووێ ﴿مَا كَسَبَتْ﴾ چونکە چاکە ئاسانتر وەدەست دێ، بەڵام بۆ خراپەکە فەرموویەتی: ﴿وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ چونکە خۆزەحمەتدانی دەوێ، لەبەر ئەوەی چاکە لەگەڵ زگماکی مرۆڤدا گونجاوە، بەڵام گوناح و تاوان پێچەوانەی فیترەت و زگماکی مرۆڤە، دوایی دەفەرمووێت:

﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ البقرة.

واتە: [پەروەردگارمان! لێمان مەگرە، ئەگەر لەبیرمان چوو، یان هەڵەمان کرد﴾.

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ البقرة.

واتە: [پەروەردگارمان! ئەوەمان مەخە سەر شان کە خستووتە سەر شانی ئۆممەتانی پێشتر (بەهۆی لادان و تاوانیانەوە هەندێ ئەرکی زیادەت خستوونەتە سەر، مەیخە سەر ئێمە)].

﴿...رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ...﴾ البقرة

پەروەردگارمان! شتێکمان مەخەرە سەر کە لە توانامانـدا نەبێ، ئنجا هەموو جارێك ئەوان دەیانگوت و داوایان دەکرد، خوای پەروەردگاریش دەیفەرموو: بەڵێ، [نعم]، یانی هەرچەندە خوای پەروەردگار خۆی ناردوویەتە خوار، بەڵام کە ئەوان دەیانگووت: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾.

خوای بەبەزەیی دەیفەرموو: [نعم] بەڵێ، ئینجا دوای ئەوە گوتیان: ﴿وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا﴾.

واتە: [چاوپۆشیمان لێ بکە و لێمان ببوورە و بەزەییت پێماندا بێ]، خوای میهرەبان فەمووی: [نعم]، بەڵێ.

﴿فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة.

واتە: [بەسەر كۆمەڵی كافراندا سەرمانخە]، خوا فەرمووی: بەڵێ.

كەواتە: كوڕی خۆم! هەر وەسوەسەیەكی خراپ كە بەدڵتدا دێ و پێت ناخۆشە، لەسەرت حیساب نییە، بۆ؟ چونكە تۆ پێت ناخۆشە، لە حەدیسی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دا هاتووە:

{ إذا سَرَّتكَ حسَنتُكَ ، وساءَتكَ سيِّئتُكَ ؛ فأنتَ مؤمِنٌ }.(١)

واتە: [ئەگەر بەچاكەت دڵخۆش بوویی و بە خراپەت دڵگران بووی، ئەوە تۆ ئیمانداری].

گوناحێك دەكەی، كەلیمەیەكی هەڵەت بەسەر زاردا دێ، نەزەرێك دەكەی، خراپەیەكت بەدڵدا دێ، پێت ناخۆشە، پێناخۆش بوونی خراپە و پێ خۆشبوونی تاعەت و چاكە، نیشانەی ئیمانە.

---

١) أخرجه أحمد برقم (٢٢٢٢٠)، وابن حبان برقم (١٧٦)، والطبراني برقم (٧٥٤٠)، قال الهيثمي (٨٦/١): رواه الطبراني في الكبير، وفي الأوسط، ورجاله رجال الصحيح، إلا أن فيه يحيى بن أبي كثير، وهو مدلس، وإن كان من رجال الصحيح. والحاكم برقم (٣٣) وقال: صحيح متصل على شرط الشيخين. ووافقه الذهبي. والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٧٤٦). وأخرجه أيضًا: الطبراني في الشاميين برقم (٢٣٣)، قال المناوي (٣٧٤/١) قال العراقي في أماليه: حديث صحيح.

ئنجا لە مەوسوعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، دەوری دوازدە (١٢) ڕیوایەتم هێناون، سەبارەت بەو کەسانەی کە گوومان و دوودڵییان بۆ دروست دەبێ، لەبارەی خوای باڵادەستەوە، یان لەبارەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، یان لەبارەی هەر شتێکەوە.

لە (صحيح البخاي)دا هاتووە: [ڕۆژێك هەندێ لە هاوەڵان چوونە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! شتی وامان بە دڵدا دێ پێمان خۆشە لە حەوت تەبەقەی ئاسمان بکەوینە خوارێ، ئەوەمان بە دڵدا نەیەت! پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە فێڵی شەیتانی گێڕاوەتەوە بۆ وەسوەسە، ئەوە شەیتان دەیەوێ دڵتان ناخۆش بکات].

پێم خۆشە لەو مەوسوعەی (ئیمان و ئیلحاد)دا تەمەشایان بکەی، دوازدە (١٢) ڕیوایەتم هێناون، قسەشم لەسەر کردوون. جا پێغەمبەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چەند تەوجیهێکی دانێ، یەکێکیان ئەگەر شتێکی واتان بەدڵدا هات، بڵێن: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)[1]. لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە

---

١) گێڕانەوەکە بەم شێوەیە هاتووە:
{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أَحَدَنَا يَجِدُ فِي نَفْسِهِ يُعَرِّضُ بِالشَّيْءِ لَأَنْ يَكُونَ حُمَمَةً أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ

دەفەرمووێت: بڵێن: (لا إله إلا الله). لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە دەفەرمووی ئەگەر شتێکی واتان بەدڵدا هات، وازی لێ بێنن و بەدوای مەکەون، چونکە ئەوە وەسوەسەیە، خەیاڵێکی خراپە کە بەدڵت دادێ، هیچ نییە بەس شەیتان دەیەوێ دڵت ناڕەحەت بکات. هیچ مرۆڤێك ناتواتێ خۆی والێبکات کە هیچ خەیاڵ و فیکرەیەکی خراپی بەدڵدا نەیەت، ئەوەتا هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ لێی خاڵیی نەبوون، خوای پەروەردگاریش سووەڕتی (الناس) و (الفلق) و (الأخلاص)ی بۆ ئەوە دابەزاندوون، کە ئەو سێ سووڕەتە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەیانیان و ئێواران بەتایبەتی و، کاتێك دەچووە سەر جێگا ئەو سێ سووڕەتەی خوێندوون، لەناو هەردوو دەستی موبارەکیدا، دوایی هەردوو دەستی بەخۆیدا هێناون. (دایکە عائیشە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا لە نەخۆشیی سەرە مەرگیشدا نەیدەتوانی دەست بەخۆیدا بهێنێ، سووڕەتەکانی لە نێو دەستی خۆی دەخوێند و منیش دەستیم دەگرت و بە لەشیمدا دەهێنا، چونکە دەستی خۆی بەڕەکەتی زیاترە]، مرۆڤ دوای ئێواران و لە دوای نوێژی بەیانی، هەریەکە لە سووڕەتی (الأخلاص) و (الفلق) و (الناس) هەروەها کە دەچێتە سەر جێگا، ئەوە بۆی

---

يَتَكَلَّمَ بِهِ فَقَالَ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ الْحَمْدُ لله الَّذي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ} أخرجه أحمد برقم (٢٠٩٧)، وأبو داود برقم (٥١١٢). وأخرجه أيضًا: النسائى فى الكبرى برقم (١٠٥٠٣)، وابن حبان برقم (١٤٧)

دەبێتە قەڵغان، دەیپارێزێت و دەیخاتە ژێر قەڵغان لەبەرامبەر وەسوەسە و خوتخوتەی شەیتان. هەروەها هەر کاتێکیش خەیاڵێکی بەدڵدا هات، کە پێی ناخۆش بوو بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) خوایە! پەنات پێدەگرم لە شەیتان، یان بڵێت (لا إله إلا الله)، یان وازی لێبێنێ و بیری لێ نەکاتەوە.

ئنجا ئەگەر هەر پرسیارێکی دیکەشت، هەیە لەو بارەوە پێم بڵێ، با بۆتی ڕوونکەمەوە.

شەریف: دەستت خۆش بێ یاخوا بابە گیان!

یەك پرسیاری دیکە دەربارەی وەسوەسە و گومان، زۆرجار شەیتان بەوە یەکێك ئەزیەت دەدات، کە هەڵەکانی بیر دێنێتەوە!

بابم:

ئنجا گوێت لێبێ کوڕی من! پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) خوا پاراستوونی، هەروەها لەپێش پێغەمبەرایەتیش هەر پاراستوونی، لە شتێك کە پێی ناشرین بن. وەك لە سیرەی (ابن هیشام)دا هاتووە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (لەسەردەمی پێش پێغەمبەرایەتییدا هیچ کاتێك وەسوەسە و خوتخوتەی خراپم بە دڵدا نەهاتووە، دوو جار نەبێ مەڕم

دەلەوەڕانــدا، شــەوێك لە پشــتی مەكــكە بە ڕەفیقــێكم گــوت: ئاگات لە مەڕەكانم بێ، تاكو من دەچمە شایی فڵان پیاو یان فڵان ئافرەتە، چووم تەمەشام كرد و خەوم لێكەوت، بەیانی بە تیشكی تاو خەبەرم بۆوە، یەكسەر خەوم پێدا كەوتبوو.

جاری دووەمیش وامكرد دیسان خەوم پێدا كەوتەوە، هەر ئەو دوو جارەش بــوو كە نییەتــی خــراپەم بەدڵــدا هــاتووە). نییەتــی خراپەكەش ئەوە بووە كە تەمەشای شایی بكات[1].

بەڵام هــاوەڵان پــێش مســوڵمان بــوون قەتڵیــان كــردووە، زینایــان كردووە، دزییان كردووە، شەڕابیان خواردووەتەوە، جۆرەها تاوانیـان كردووە. هەتا (عەمری كوڕی عاس) كە دەچێت تاكو ببێتە مســـوڵمان پێغەمـــبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەســـتی بـــۆ درێـــژ دەكــات، عەمــر دەســتی دەكێشــێتەوە! پێغەمــبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فەرمــووی چییە عەمر بۆ دەستت دەكێشیەوە؟ عەمر دەڵـــێ ئەی پێغەمـــبەری خـــوا مەرجـــم هەیە! پێغەمبەرمـــان دەفەرمووێــت: مەرجــت چیــیە؟ عەمــر دەڵــێ: ئەی پێغەمــبەری خوا! من زۆر دژایەتیی تۆ و ئسلامم كردووە، مەرجم ئەوەیە خوا لە هەموو گوناحێكم خۆشبێ، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

١) بێگومان شایی و سەماو هەڵپەڕینی ئەوساكە "ڕۆژگاری نەفامیی" ڕەشبەڵەك و تێكەڵ پێكەڵی ژن و پیاوان بووە، وەك هەموو سەردەمە نەفامییەكانی دیكە!

دەفەرمووێت: دەستت بێنە عەمر، ئەی نازانی: (الإسلامُ يهدمُ ما كان قبلَه، والهجرة تَجبّ ما كان قبلها)[١]. واتە: [ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوە و کۆچکردنیش پێش خۆی دەسڕێتەوە؟].

ئنجا کە تەوبەت کرد و بەڕاستیی بۆ لای خوای پەروەردگار گەڕایەوە، خوای میهرەبان پاکت دەکاتەوە و پێویست ناکات و ئەو خوتخوتە و خەیاڵانە بە دڵی خۆتدا مەهێنە، چونکە خوای پەروەردگار ئێمەی وا خوڵقاندووە، کە هەم گوناح کردنمان لەتوانادا هەیە، هەم چاکە کردنیش. ئیدی کە مرۆڤ بڕیاریدا واز لە گوناح و تاوان و هەڵە و کەمووکورتیی بهێنێ و بگەڕێتەوە سەر ڕێگای شەریعەت، تازە با لێنەگەڕێ شەیتان مێشکی بکۆڵێ و دڵی کرمێ بکات و، گەرای وەسوەسە لەدڵیدا دابنێ!

ئەمەش دەرسی ئەمشەومان بوو.

والسلام عليكم ورحمة الله

١) أخرجه الطبراني كما في مجمع الزوائد (٣٥١/٩) . وأخرجه أيضًا: أحمد برقم (١٧٨٤٦) قال الهيثمي (٣٥١/٩): رجالهما ثقات. والبيهقي (١٢٣/٩، رقم ١٨٠٦٩).

## ٢٢




## ئیرادە

شەریف: باسی حەقیقەتی ئەم ژیانەمان کرد، مرۆڤ بۆچی دەژی و بۆچی بژی؟ دوایی دەربارەی گەڕانەوە بۆ لای خوا و تەزکییەکردنی نەفس، ئەمجارە باس لە (ئیرادە) دەکەین، چونکە بەبێ ئیرادە و جڵەوی خۆکردن، مرۆڤ هیچی پێناکرێ، هەموو کارەکانی لە نیوەی ڕێگادا بەجێدێڵێ، یانی: مرۆڤ زۆر جار شتێك دەزانێ، بەڵام نایتوانێ، ئیرادە و توانای بەسەر خۆیدا ناشکێ، نەفسی وەك دڕندەیەك وایە نایەتە ژێر ڕکێفییەوە، وەك چۆن ئاشنابوون بەخۆت گرنگترین کارە بیکەی، جڵەوکردنی نەفس و بڕیاربەدەستبوون لەگەڵ خۆت و ئیرادەهەبوون سەرەتاییترین کارە بیکەی، ئەگەر بتهەوێ دارێك لەسەر بەرد دابنێی.

بابە گیان! چۆن کەسێك بتوانێ جڵەوی نەفسی خۆی بکات و عەقڵ و دڵ و هەستەکانی بهێنێتە ژێر ئیرادەی خۆیەوە؟

بـابــم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

كاك شەریف گیان!

دیارە خوای پەروەردگار دوو هێزی داون بە مرۆڤ: هێزێکیان کە عەقڵە دەرکی شتی پێ دەکات، شتی پێ کەشف دەکات و پێی دەزانێ. هێزەکەی دیکەش هێزی دڵە، کە بڕیاری پێ دەدات، جاری وایە ئینسان شتێك دەزانێ، بەڵام نایتوانێ. جاری وایە لە شتێك حاڵی دەبێت، بەڵام تێیدا نەبۆتە حاڵ، بۆیە زۆر جار دەڵێم: دەبێ ئینسان هەوڵبدات حاڵیبونەکەی لە خۆیدا بکاتە حاڵ، زانینەکەی بگۆڕێ بۆ توانین، وەك چۆن شارەزایە، کاراش بێت، ئنجا ئەوانەش ڕێژەیین، بەڵام دوای ئەوەی کە هیدایەت باش لە دڵی ئینساندا دەچەسپێ وای لێدێ هەرچی بیزانێ، بیتوانێ، وای لێدێ هەموو ئەو شتانەی دەیزانێ باشن، ئەنجامیان بدات و ئەوشتانەی کە دەزانێ خراپن، خۆییان لێ بەدوور بگرێ، ئا ئەوشە پێی دەگوترێ: حاڵەتی گەیشتن بە یەقین، بەدڵنیایی، کە ئینسان عیلمەکەی یەکسەر دەبێ بە عەمەل، زانینەکەی یەکسەر بگۆڕێ بۆ توانین، ئێستا تۆ

تەماشا بکە! بابەیەکی جگەرەکێش دەزانێ جگەرە خراپە و زیانبەخشە و زەرەری ماڵیی و جەستەیی و دەروونیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی هەیە، بەڵام بۆچی دەستی پێ لێهەڵناگیرێ؟ لە ڕاستییدا ئەوە زانیارییەکەی هەر زانیارییەکی ڕووتە، هەر لە مێشکیدایە، بەڵام تەحویل نەبووە بۆ دڵ و دەروونی. هەروەها هی وا هەیە دەزانێ فلان عیبادەتە، یاخود نوێژی سوننەت، یان شەونوێژ، یان نوێژی دیکە، یان قورئان خوێندن، یا زیکرکردن، یان پەرستشی دیکە دەزانێ خێری هەیە، بەڵام بۆی ناکرێ! ئنجا دەبێ ئینسان زیاتر مەشق بەخۆی بکات و، خۆی ڕابێنێ، دەبێ خۆی ڕابێنێ کە هەر شتێك بزانێ بیتوانێ و ئەنجامی بدات، هیچ شتێك بەبێ خۆڕاهێنان و مەشق بەخۆکردن و کار لەسەرخۆکردن، بۆ ئینسان دەستەبەر نابێ.

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ:

{إِنَّما العلمُ بِالتَّعَلُّمِ وإنما الحلم بِالتَّحَلُّمِ}.[1]

واتە: [زانیاریی بەفێربوونە و، هێدیی و مەندیی بەخۆڕاهێنانە].

---

١) أخرجه الطبراني في الأوسط برقم (٢٦٦٣)، قال الهيثمي (١/١٢٨٩): فيه محمد بن الحسن بن أبي يزيد وهو كذاب. والخطيب (٥/٢٠١)، وابن عساكر (٩٧/١٨).

هەروەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی:

{وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ}.[1]

واتە: [هەر كەسێ خۆی لەسەر عیففەت (واتە پاكیی یاخود عیففەت پێچەوانەی نەوسنیی و پێچەوانەی ئارەزوو بۆ شتی گوناح و خراپ چوونە) پاكیی ڕابێنێ، خوا عیففەتی پێدەبەخشێ و، هەر كەسێ خۆی لەسەر بێنیازیی ڕابێنێ، خوا بێنیازیی پێدەبەخشێ و، هەركەسێ خۆی لەسەر خۆڕاگریی ڕابێنێ، خوا خۆڕاگریی پێدەبەخشێ].

یانی دەبێ كار لەسەر خۆتبكەی، بەبێ كار لەسەر خۆكردن، كەس لە زگی دایكی خۆیدا چاك نەبووە، كەسیش خراپ نەبووە، جاری دیكەش هەر باسمكردووە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾﴾ النحل.

واتە: [خوا لە زگی دایكتان دەریهێناون هیچ شتێكتان نە دەزانی؛ نە خێر نە شەڕ، بەڵام بیستن و چاوەكان و عەقڵەكانی

---

١) أخرجه البخاري برقم (١٤٠٠)، ومسلم برقم (١٠٥٣).

پێدان، بەڵكو سوپاسگوزاربن].

سوپاسگوزاریی بۆ خوا، ئەوەیە كە تۆ ئەو نیعمەتانەی خوا پێت دەدات، لە ڕەزامەندیی خوادا بەكاریانبێنی. ئنجا ئەوەش بزانە! وەك چۆن جەستە (بدن)ی ئینسان بە مەشقكردن و ڕاهێنان بەهێزدەبێت، ئەوانەی كاراتە دەكەن، ئەوانەی كۆنگفۆ دەكەن، ئەوانەی جومناستیك دەكەن، ئەوانەی تۆپێنە دەكەن یان جۆرە وەرزشی دیكە دەكەن، ئەوانەی كاروكاسبیی دیكە دەكەن، جەستەیان ڕادێ و بەهێزدەبێ، بۆ وێنە: بەبیرم دێت ئەو كاتەی لە تەمەنی تۆدا و گچكەتریش بووم، كیسە چیمەنتۆم هەڵدەهێنا و فڕێم دەدا، تەنەكەی پڕ لە چیمەنتۆم دەدایە وەستا! یانی مەبەستم ئەوەیە ئەو جەستەیە وەك چۆن ئینسان لە ڕووی جەستەییەوە، ئەگەر كار لەسەر خۆی بكات ماسوولكەكانی بەهێزدەبن و، جومگەكانی بەهێزدەبن و پێستی چیڕ و قایم دەبێ، هەروەها چاوت كە زیاتر كاری پێ بكەی و تەماشای شوێنی دوور بكەی، چاوت مەشق پێ بكەی، چاوت بەهێز دەبێ، گوێت زیاتر كاری پێبكەی و ڕایبهێنی، بەهێزتر دەبێ، بەعزە كەسێك گوێی بەهێزترە، هەروەها شت لەبەركردن و شت لە مێشكی خۆداهێشتنەوە بەهۆی (حافظة و ذاكرة)ەوە، هەمووی ڕاهێنانە، وەك چۆن ئەندامەكانمان وان، ئەندامە جەستەییەكان، بەهەمان شێوە هێزە پەنهانەكانیش وان، ئیرادەش بەمەشق و

ڕاهێنان بەهێز دەبێت، یانی: ئەگەر خۆت لەسەر تاعەت ڕاهێنا، فەرمانبەری (مطیع) دەبێ، کە خۆت لەسەر چاکە ڕاهێنا، چاکە کاردەبی، خۆت لەسەر ڕەوشت بەرزیی ڕابێنی، ڕەوشت بەرز دەبی. وەك حەدیسەکە دەفەرمووێ: ئەگەر خۆت لەسەر وازهێنان لە گوناح و شتی سووکەڵە ڕاهێنا، بەو شێوەیەت لێ دێ و ئیرادەت بەهێز دەبێ، لەناخەوە ڕووحەکەت بەقووەت دەبێ، لە ئەنجامی ئەو ڕاهێنان و مەشقکردنانەدا، ئەگەرنا هیچ کەس هەر لەڕێوە چاك نەبووە و هیچ کەسیش لەڕێوە خراپ نییە، هەڵبەتە ئینسان لە بنەڕەتدا، بەباری خێر و چاکەدایە، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ:

{كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ علَى الفِطْرَةِ، فأبَوَاهُ يُهَوِّدَانِه، أوْ يُنَصِّرَانِه، أوْ يُمَجِّسَانِه، كَمَثَلِ البَهِيمَةِ تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بهيمةً جمعَاء، هلْ تَرَى فِيهَا جَدْعَاءَ؟}.[1]

واتە: [(هەموو کەسێك) هەموو منداڵێك لەسەر زگماك (واتە لەسەر زگماکی خواناسیی و خواپەرستیی) لە دایك دەبێ، دوایی باب و دایکی دەیکەنە جوولەکە و دەیکەنە نەسڕانیی و دەیکەنە مەجووسیی].

وەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ کە لە دایك دەبێ تێر و تەواوە، ئایا هیچ دەبینی لووتی بڕابێ یان گوێی؟ واتە: هیچ

---

١) أخرجه البخاري برقم: (١٣١٩).

نوقوستانییەکی تێدا دەبینی؟ نەخێر، بەڵام دوایی مرۆڤەکان دەستکاریی دەکەن، کەواتە: مرۆڤ لەئەسڵدا بەباری خێردایە بەڵام ژینگە و دەورووبەری تێکی دەدەن، بەڵام ئەگەر ئینسان بیەوێ دەبێ مەشق بەخۆی بکات و، خۆی ڕابێنێ و، کار لەسەر خۆی بکات، خۆی بەو شێوەیە لێ دەکات کە خواپەسندە، ئەدی بۆچی خوای پەروەردگار داینـاوە لە ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژبکەین؟!

جارێك کابرایەك تازە فێری نوێژ دەبوو دەیگووت: "مامۆستا! نوێژەکانم هەموویان بۆ ناکرێن لە کاتی خۆیدا! گوتم: ئەیی چی دەکەی؟ گوتی: کە دەچمەوە شەوێ، هەر پێنجیان بەیەکەوە دەکەم! منیش گوتم: جا ئایا تۆ دەتوانی خواردنی سێ ڕۆژان بە یەك ڕۆژ بخۆی؟ گوتی: نەوەڵڵا. گوتم: خوای پەروەردگاریش ئەوەی کە داناوە، دیارە لە ڕۆژێکدا پێنج جار ڕووح و جەستە و عەقڵ و هۆشی تۆ، پێویستیی بەوەیە پێنج جاران بچیە خزمەت خوا، نەك یەك جار بچی لەجیاتی هەر پێنجان! هەروەك چۆن جەستەت پێویستی بەوە هەیە شەو و ڕۆژی دوو جاران خواردن بخۆی یان هەموو ڕۆژێ ژەمێکی بکەی، ناکرێ بڵێی: حەفتەی یەك جاری خواردن دەخۆم! بەهەمان شێوە ئەو تاعەتانەی خوا داینـاوە:

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾ النساء.

هەڵبەتە ئێمە پێویستیمان پێی هەیە، بۆ ئەوەی ناخ و ڕووح و جەوهەرمان تێر و سەلامەت بێ، پێویستییمان بەوەیە ڕۆژی پێنج جار بچینە خزمەت خوا بەلایەنی کەمەوە ئەگەر هەر نوێژە فەرزەکانیش بکەین، بەڵام دیارە ساڵی مانگێك پێویستیمان بە ڕۆژوو هەیە، ڕۆژووەکەش پێویستە بەسەریەکەوە (متواصل) بێت. یەك مانگ، هەڵبەتە ڕۆژووە سوننەتەکانیش هەر هەن".

ئنجا وەك گوتم: کوڕی خۆم! ئیرادە بە کاری چاك و خۆلەسەرڕاهێنان بەهێز دەبێ، بەتایبەتی ڕۆژووگرتن، بۆ زانیارییت! ڕۆژوو ئیرادەی ئینسان زۆر بەهێز دەکات، هەموو تاعەتەکانیش ئینسان بەهێز دەکەن، ڕووحی بەقووەت دەکەن و، وای لێ دەکەن بتوانێ خاوەنی بڕیاری خۆی بێت، هەروەها ناشبێ کە بڕیارێك دەدەی، دوای بۆت جێبەجێ ناکرێ لەخۆت نەکەویە شك و گومان چونکە شەیتان هەمیشە لەگەڵ ئینسان خەریکە، نەکەوتن گرنگە بەڵام کەوتن و هەڵسانەوە گرینگترە، هیچ کەسێك نییە ڕەتەڵ نەبات و نەکەوێ بەڵام گرنگ ئەوەیە هەڵسێتەوە.

ئەمەش قسەی ئەمشەومان بوو.
والسلام عليكم ورحمة الله




## کـات و تـەمـەن

شەریف: گرفتێکی زۆر گەورەی ئەم سەردەمە دەست بەتاڵیی و قەدر نەزانینـی کـات و دەرفەتـی تەمەنە، ئەو دەسـت بەتـاڵییە، مـرۆڤ تووشی چەندان نەخۆشیی دەروونیی و جەستەیی دەکات. ئیمامی غەززالـی (ڕەحمەتـی خوای لێبـێ) گوتـوویەتی: "مـرۆڤ ئەگەر دەستی بەتـاڵ بـوو، وەك ئاشـێکی بەتـاڵ وایە، کە هیچـی تێـدانەبوو خـۆی دەهاڕێ و خۆی دەشکێنێ". زۆرێك لە دەروونناسەکانیش دەڵـێن: هەرچۆنێـك بـێ خـۆت سـەرقاڵ بـکە و، مەهـێڵە کاتت هەبێ بیریکەیەوە، دڵت خۆشە یان نا؟ چونکە ئەو کاتە بەتاڵەیە دڵت ناخۆش دەکات، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە تەنیا پڕکردنەوەی کاتەکان نییە و، ڕاکردن نییە لە بەتـاڵیی، بەڵکـو چـۆنییەتی پڕکـردنەوەی کـاتە بە باشترینی شتەکان.

بـابه گیـان! پـێم خۆشـه بـۆم بـاس بـکەی گرنگیـی کـات چییه و، باشترین شت کەسێك له کاتەکانیدا بیکات چییه؟

بـابــم:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الحمد لله وصلى الله تعالى وسلم وبارک على رسـول الـله محمد واله وصحبه وسلم.

کاك شەریف گیان!

ئەمشەو بۆت باسی گرنگیی کـات دەکەم له ژیـانی مرۆڤی مسوڵماندا:

خــوای پەروەردگــار ســوێند دەخــوا بە ڕۆژگــار و زەمــان و دەفەرمووێ:

﴿وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾﴾ العصر.

مانای سوورەتی (العصر) ئاوایە: [بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. سوێند بە عەصر (زەمان و ڕۆژگار) مرۆڤ لە زیانباریدایە. بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوە (بە هەموو ئە وشتانەی پێویستە بڕوایان پێبهێنرێ) و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن و، یەکدی ڕادەسپێرن بەحەق و، یەکدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی].

کەواتە: زەمان و ڕۆژگار ئەوەندە گرنگە خوا بەخشندە سوێندی پێ خواردووە، هەروەها خوا لە سوورەتی (الحجر)دا سوێند بە تەمەنی پێغەمبەر دەخوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمووێ:

﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الحجر.

واتە: [سوێند بە تەمەنی تۆ، ئەوان لە بێهۆشیی خۆیاندا سەراسیمە و سەرگەردان بوون].

واتە: گەلی لووت (عليه الصلاة والسلام)، ئینسانی ئیماندار دەبێ تەماشای ژیانی خۆی بکات، ئەوەندە ساڵانەی کە بۆی دانراون، کە نازانێ کۆتاییەکەی کەیە، دەسمایە و سەرمایەی بوونی ئەون. وەك چۆن کەسێك کە بازرگانیی و سەودا و مامەڵەیەك دەکات، ئەو پارەیە کە بەدەستییەوەیەتی دەستمایەیەتی، بەبێ ئەو دەستمایەیە هیچی بۆ ناکرێ،

مـرۆڤیش بەبـێ تەمەن، هیچـی بـۆ نـاکرێ. تەمەن دەگـونجێ عـومری پـێ بگـوترێ، ئەگەر بـۆ مـرۆڤ بەکـاربهێنرێ، یـان بۆشتێکی دیـارییکراو، ئەگەر بە ڕەهـایی بەکـاربهێنرێ، وەقتـی بـۆ بە کاردەهێنـدرێ، یـان کـات (زمـن) یـاخود (عصـر)ی بـۆ بەکاربهێنرێ، ئەگەر بەڕەهایی بگوترێ، بەڵام ئەگەر بگـوترێ: بۆ نموونە: تەمەنی ئەو چیایە، تەمەنی گەردوون، یان تەمەنی مـرۆڤ، تەمەنـی فـلان ئـاژەڵە، تەمەنـی ئەوەنـدە سـاڵەیە، ئەوە وشـەی تەمەن (عمـر) بەکاردەهێنـدرێ، دەنـا لەگەڵ (عمـر) و (وقت) و (زمن) هەریەك واتایان هەیە.

ئنجـا فەرمایشـتێکی پێغەمـبەر هەیە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەوبارەوە، دەفەرمـووێ: { لا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّـى يُسْـأَلَ عَنْ عُمُرِه فِيمَا أَفْنَاهُ}[1]. واتە: [دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی دواییـدا بەمـلاولادا نـاچن، تـاکو پرسـیاری لێـدەکرێ: تەمەنـی لەچیدا بەڕێکردووە؟].

ئینسانی مسوڵمان دەبێ زۆر بە خەمی تەمەنی خۆیەوەبێ، چـونکە دەزانـێ بەبـێ ئەو کـات و وەخـتە، هـیچ شـتێکی بـۆ نـاکرێ و لە سـەرمایە و دەسـتمایەی بـوونیەتی. بـۆیە خـوا (سبحانه وتعالی) لە سوورەتی (المؤمنون)دا دووەمـین سیفەت کە

---

١) أخرجـه الترمـذي بـرقم (٢٤١٧) وقـال: حسـن صـحيح، وأبـو يعلـى بـرقم (٧٤٣٤)، وأبو نعيم في الحلية (١٠/٢٣٢).

ئیمانـدارانی پـێ پێناسـە دەكـات، ئەوەیە كە كاتیـان بە شـتی پووچ بەڕێ ناكەن، دەفەرمووێ:

﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾﴾ المؤمنون.

واتە: [بەڕاسـتیی بـڕواداران سـەرفرازن، ئەوانەی كە لـە نوێژەكانیانـدا بۆ خـوا ملكەچـن و ئەوانەی كە پشت لە قسـە و ڕەفتـاری پـووچ دەكەن (لغـو: هەر شـتێكە كە سـوودێكی نەبێ بۆ ئینسان چ قسە بێ چ كردەوە بێ)].

لە سووڕەتی (الفاطر)دا ڕستەیەكی موبارەك هەیە لە قوڕئان زۆر جێی سەرنجە كە خوای پەروەردگار لەوەڵامـی ئەوانەدا كە تووشی دۆزەخ بوون دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾﴾ فاطر.

یـانی: [ئەوانەی بێبـڕوان لە ئـاگری دۆزەخدان كۆتاییـان پـێ ناهێنرێ بمرن و سزا لە سەریان سووك ناكرێ، هەر ئاواش سزای هەر سپڵەیەك دەدەین].

﴿وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ فاطر: ٣٧.

واتە: [ئەوان لە وێدا هاوارو ڕۆڕۆ دەکەن: پەروەردگارمان! دەرمان بێنە کردەوەی چاك بکەین، جیا لەوەی کە کاتی خۆی کردوومانە لەدونیادا].

خواش ئاوا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرمووێ:

﴿أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ٣٧﴾ فاطر.

واتە: [ئایا بایی ئەوەندە تەمەنمان، پێنەدان کە ئەگەر کەسێ ویستبای بیری بکەوێتەوە و پەندی وەرگرتبایە، پەندی وەردەگرت و بیری دەکەوتەوە، دە بچێژن، ستەمکاران هیچ یارمەتییدەر و هاوکارێکیان نییە].

ئینسان دەبێ زۆر بەخەم کاتی خۆیەوەبێ، کە نەك هەر لە گوناح و تاواندا سەرفی نەکات، بەڵکو لە شتی بێهوودەشدا کە بە عەرەبیی (اللغو)ی پێدەگوترێ، تەمەنی لە پووچ و بێهوودە و بێسووددا بەکار نەهێنێ. زۆربەی سەرگەرمیی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە، بە تەکنۆلۆجیا و بە ئینتەرنێتەوە، جا بە هەموو شێوازەکانی، کۆمپیوتەر و مۆبایل و فەیسبووك و ئەوانە، کە

زۆربەی هەرەزۆری دەچێتە قاڵبی لەغووەوە، ئەگەر نەچێتە قاڵبی گوناحیشەوە، دەچێتە قاڵبی شتی پووچەوە.

بۆیە ئینسان دەبێ زۆر وریابێ لە بەکارهێنانی تەمەنی خۆیداو چرووك بێ و سەخیی نەبێ، قسەیەك كە بە دەدەقە دەكرێ، نیو سەعاتی پێوە سەرف نەكات، مەبەستێك كە بەسێ خولەك دەگوترێ، وەختی پتری پێوە نەگرێ، چونكە هەموو شتێك قەرەبوو دەكرێتەوە، بەس تەمەن قەرەبوو ناكرێتەوە.

ئێستا بۆ نموونە ئەمشەو، سەری ساڵی زاینییە: ٢٠٢٠/١/١ بەرامبەر ١٤٤١/٥/٧ كۆچیی. ئەمشەو شەوەكەیەتی دەبێتە یەك لەسەر دوو، هەروەك بۆ مانگی كۆچییش دەبێتە حەوت لەسەر هەشتی مانگی پێنج، واتە حەوت لەسەر هەشتی مانگی (جماد الاولی). ئێمە ئەمشەو لە تەمەنمان، یەكدانە شەوە، دووبارە نابێتەوە، هەروەها سەعاتەكانی ئەمشەوە و سەعاتەكانی ڕۆژەكەش.

كەواتە: هەر تاوێك، چركەیەك، لە تەمەنی مرۆڤ كە دەڕوا، هیچ یەكێك لە كات و سات و چركەكان بە یەكێكی دیكە قەرەبوو نابێتەوە، یەكێ لە فەیلەسووفەكان قسەیەكی جوان دەكات، دەڵێ "زەمەن وەك ڕووبارێك وایە، هیچ كاتێك

مـرۆڤ نـاتوانیَ دوو جـار دەسـتی تێبخـات، ئەو ئـاوەی ئێسـتا دەستی تێدەخات دەڕوات و ئاوێکی دیکەی تازە دێتە جێگای".

ئنجـا ئامۆژگارییـت دەکەم کـوڕی خـۆم! دەڵـێم: ئەوەی کە توانیومە لە تەمەنی خۆمدا پێی هەڵسم، یەکێ لەهۆکارەکانی ئەوەبووە کە خوای پەروەردگار یارمەتی داوم، ئاگام لە تەمەنی خۆم بیَ و لە شتی بێهوودەدا، لە شتی پووچدا بەڕێی نەکەم. ئێسـتاش لە یـادمە هەر لە قۆنـاغی ناوەنـدییەوە، لە قۆنـاغی سەرەتاییشـدا، شـتم دەخوێنـدەوە، بەڵام شـتێکی سـادە، ئنجـا ئەو کاتە زۆر بەتەنگ کاتی خۆمەوە بـووم، ئەوەی کە ڕەفیقەکانم کاتی خۆیان پێوە بەسەردەبرد، دەچوونە بازاڕ و پیاسـەیان دەکـرد، گەڕان و سـووڕان، یـان دادەنیشـتن حیکایەتیـان دەکـرد، مـن هەر پێم سەیربوو، دەمگـوت: بـۆچی دەبیَ ئینسـان تەمەنـی خـۆی وا لیَ بەلا بیَ، ئەو کاتەی خۆی بەشتی پووچەوە سـەرف بکـات؟ هەڵـبەتە ئەوە بەزەیـی خـوای بەخشـەر بـوو، دەنـا ئەوەی ئێسـتا دەیـزانم، ئەو کـاتە نەمزانیـوە. دەبیَ ئینسـان ئاگـاداری تەمەنـی خۆی بیَ.

تەمەنـی ئینسـان لە چەنـد سـاڵێك پێکـدێت نـازانیَ چەنـدەن، سـاڵی لە دوازدە مانـگ، مانـگ لە چـوار حەفـتە، حەفـتە لە حەوت ڕۆژ، ڕۆژ لە بیست و چوار (٢٤) سـەعات، سـەعات لە شەسـت (٦٠) خـولەك، خـولەکیش لە شەسـت (٦٠) چـرکە

پێکدێت. کەواتە: چرکەکانی تەمەنی ئینسان ئەگەر مرۆڤ ئاگای لە چرکەکانی نەبێ، خولەکەکان دەڕۆن، ئەگەر ئاگای لە دەقەکان نەبێ، ڕۆژەکان دەڕۆن، ئەگەر ئاگای لە ڕۆژەکان نەبێ، حەفتە دەڕوا، مانگ دەڕوا، ساڵ دەڕوا.

خوا یارمەتی تۆش و ڕەفیقەکانیشت بدات و، هەرکەسێ کە قسەکانمان دەبیستێ، کە تەمەنی خۆمان نەك هەر لە گوناح و تاوان، بەڵکو لە شتی پووچیشدا سەرف نەکەین، ئینسانی ئیماندار دەتوانێ: هەرکاتێك بیربکاتەوە، زیکر بکات، یان موتاڵەعە بکات، یان قورئان بخوێنێ، یان قسەی خێر بکات، یان قسەی خێر ببیستێ، یان کاروکەسابەت بکات، ڕزقی حەڵاڵ پەیداکات، یاخود خەریکی سەردانی دۆست و خزمان بێت و سیلەی ڕەحم و ڕەفاقەت و دۆستایەتیی جێبەجێ بکات، ئینسانی ئیماندار دەتوانێ هیچ کاتێ بێ ئیش نەبێ، دەتوانێ لە بۆشاییدا نەبێ. لە ڕاستییدا کاتێ ئینسان لە بۆشاییدا دەژییەت، ئەو کاتە شەیتان زیاتر زەفەری پێ دەبات، شەیتان زەفەر بە کەسێ دەبات کە لە بۆشاییدا دەژیەت، لە بێکارییدا دەژییەت، بەڵام ئەگەر ئینسان کاتەکانی خۆی پڕکردنەوە لە کاری بەسوود، شەیتان ناتوانێ خوتخوتە و خەیاڵی نابەجێ بکاتە دڵ و دەروونیەوە، گەورەترین هۆکاری خوتخوتە و خەیالاتی نابەجێ، بۆشایی و سەرگەرم نەبوونی ئینسانە بە

حەقەوە، یەکێ لە زانایان جوان دەڵێ "نەفس ئەگەر بە حەقەوە مەشغووڵی نەکەی، ئەو بەناحەقەوە مەشغووڵت دەکات".

ئەمەش قسەی ئەمشەومان بوو، هیوادارم بەهرەی لێوەربگری.




## ئامۆژگارییەکی بابم

**شەریف:** بابە گیان! ئەمە تەوەری پێش کۆتاییە، پێم خۆشە ئەم تەوەرە تەنها بۆچوونی جەنابت بێ، ئامۆژگارییەك جەنابت بە گرنگی بزانی بۆم.

**بـابــم:**

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

کوڕی خۆم!

ئەمشەویش هەر لە بارەی قورئانەوە هەندێ شتت بۆ باس دەکەم.



**(١)** یەکەم شت کە بە دڵمدا دێ بۆت باس بکەم، ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرمووێ:

﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ٢٣﴾ الزمر.

ئەم ئایەتە موبارەکە خوای پەروەردگار تێیدا دە (١٠) سیفەتی قورئان دەخاتەڕوو، دەفەرمووێ:

[خوا باشترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارێ، کتێبێکە کە ئایەتەکانی پێکدەچن (یان بابەتەکانی وێکدەچن بابەتەکان تێیدا دووپات کراوەن) ئەو کەسانەی سام لە پەروەردگاریان دەکەن، بەهۆیەوە پێستیان تەزووی پێدا دێ (بە بیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بۆ لای یادی خوا (سەرەتا پێستیان تەزووی پێدادێ، بەڵام دوایی وردە وردە دڵیان نەرم دەبێ، دوای ئەوەی زیاتر کارلێکی لەگەڵدا دەکەن) ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر کەسێ کە بیەوێ پێی ڕێنمای دەکات (یان پێی ڕاستە ڕێ دەکات) هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات (لەبەر ئەوەی شایستەی گومڕابوونە چونکە هیدایەتی خوا قبووڵ ناکات) ئەوە هیچ کەس ناتوانێ ڕێنمایی بکا].

ئنجا کوڕی خۆم! بێگومان قورئان نوور و بەرەکەتێکی ڕەها و بێسنوورە. یانی: تۆ هەر شتێکی دیکە بگری، لە (ماددیی و مەعنەویی) سنوورێکی هەیە، بەڵام نوور و بەرەکەت و پیێزی قورئان، سنووری نیە و ڕەهایە، لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی قورئان فەرمایشتی خوایە، خواش (سبحانه وتعالى) هەموو سیفەتەکانی بێسنوورن و ڕەهان، هیچ سنوور و نێوانێك نییە لێی تەواو بن، لەویٰ کۆتاییان بیٰ، هەر بۆیە تەماشا دەکەی قورئان بە درێژایی مێژووی ئیسلام، لەو کاتەوەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قورئان بۆ سەر دڵی موبارەکی دابەزیوە، هاوەڵانی بەڕێزی وەریانگرتووە، لەو کاتەوە زانایان بە سەدان جۆرە لێکدانەوە و تەفسیریان بۆکردووە، دیارە ئەو لێکدانەوە و تەفسیرانەش وەنەبیٰ کە لە هەموو شتیٰ لێك جیابن، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە زانایان هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) خەریکی لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی مانا و مەبەستەکانی قورئانن، هیچ کامیان نەیگوتووە ئەوەی پێشیٰ هەرچی لە قورئاندا هەیە، دەریهێناوە و من پێویست ناکات خەریکی لێکدانەوەی قورئان بم! ئەگەر تا دونیا کۆتایی دێت مسوڵمانان خەریکی تەفسیرکردنی قورئان بن، زانایان خەریکی لێکۆڵینەوە بن، لە هەموو بوارەکانی زانستییدا، ناگەنە کۆتایی

بەڵام ئینسان سنوورداره، بێگومان هەر كەسە بە ئەندازەی خۆی لە قورئان بەهرەمەند دەبێت.

بەڵێ، خوای مەزن بێسنووره، بەڵام ئێمە سنووردارین، فەرمایشتی خوا بەرەكەتەكەی بێسنووره، بەڵام ئێمە توانای وەرگرتن و هەزمكردنمان سنوورداره، بۆیە خوا لە سوورەتی (رعد)دا دەفەرمووێ:

﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا ﴾ الرعد: ١٧

واتە: [ئەو خوایەی كە لە ئاسمانەوە بارانی بۆ دابەزاندووە، ئنجا دۆڵەكان بەئەندازەی خۆیان ئەو ئاوە وەردەگرن].

مرۆڤەكانیش هەر كەسە بەئەندازەی خۆی لە هیدایەتی قورئان و ئیمان و ئیسلام بەهرەمەند دەبێ، هەروەها لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بەهرە وەردەگرێ، جا نەك هەر ئێستاش، هەر لە رۆژگاری خۆشیدا ئەو بەهرە و سوودەی كە (أبو بكر و عمر) (خوا لێیان رازی بێت) وەریانگرتووە لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەروەها (عثمان و علي) هاوەڵانی دیكەی، كە زۆر لێی نزیك بوون، زۆر زیاتر بووە لەو بەهرەو سوودەی كە هاوەڵانی دیكە وەریانگرتووە، چونكە ئەوانەی زۆر لێی نزیكبوون توانا (ظرفیة)ی وەرگرتن و ئیستیحابیان زیاتر بووە، ساغتر و دڵسۆزانەتر و لێبڕاوانەتر لەخزمەت خوا و، لەخزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و، لە خزمەت قورئان و ئیسلامدا بوون، ئێمەش ئێستا لەم

ڕۆژگـارەی خۆمانـدا هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی ئـەوەی خـۆی یـەکلایـی دەکاتـەوە و خـۆی تـەرخان دەکـات، دڵـی خـۆی سـاغ دەکاتەوە، بە ئەندازەی ئەوە لە قورئان بەهرەمەند دەبێت. هـەروەها لــە ڕێبــازی پێغەمبــەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کــە ڕێبــازی پێغەمـبەریش هـەر بریتییـە لـە بەرجەسـتەکردنـی قورئـان لەسـەر ئەرزی واقیع و لە واقیعدا.

**(٢)** ئامۆژگارییت دەکەم: تاکو بۆت دەکرێ لە ڕووی دڵی خۆسـاغکردنەوەوە، لەو ڕووەوە کە هانـدەرت چییـە و پـاڵنەرت؟ هاندەر و پاڵنەرت دەبێ تەنیا ئەوە بێ کە زیاتر لە خوا نزیك بی و، زیـاتر خـوا لـە خـۆت ڕازی بکـەی، تەنانـەت هەنـدێك لـە زانایـانی ئـەهلی عیرفـان و تـەزکییـە دەڵـێن: "ئەگـەر ئینسـان نییـەتـەکـەی وا بـێ کـە بەهەشـتیش وەدەسـت بهێنـێ، یـان لـە دۆزەخیش پارێزراو بێ، ئەوەش زۆر بەهێز نییە". بەڵێ تۆ دەبێ داوا لە خوا بکەی: خوا بتخاتە بەهەشەوە و لـە دۆزەخ چەپاڵـەت بدات، بەڵام تۆ دەبێ مەبەستت و هاندەرت ئەوەبێ لە خوا نزیك بی، خـوا لێـت ڕازیبێـت، جـا ئـەوەی خـواش لێـی ڕازی بـوو، دەیخاتـە بەهەشـتەوە. مەبەسـتم ئـەوەیـە ئـەو پاڵنـەر و هانـدەرە زۆر گرنگە، جا چ بۆ عیبادەتێکی دیارییکراو کە ئەنجامی دەدەی، یاخود کە دەتەوێ لە قورئان زیاتر تێبگـەی، یـان دەتـەوێ زیـاتر

بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاشنا بیت، ئەو دڵی خۆساغکردنەوە لە خڵتەی سەرنج ڕاکێشانی خەڵك، لە خڵتەی دونیا پێ مەبەست بوون، یەکجار گرنگە چونکە جاری وا هەیە کە نیەتەکەت تەواو نییە، مەرج نییە لەبەر ئەوەبێ کە مەبەستت بەرژەوەندییەکی ماددییە، بەڵکو جاری وا هەیە ئەو کەسە ئامانجی بەرژەوەندییەکی مەعنەوییە، بۆ وێنە: دەیەوێ لە نێو خەڵکدا حورمەت و ڕێزی هەبێ، قەڕەباڵغیی بە دەورەوە بێ، خەڵك بە ئینسانی باشی بزانن، دەبێ ئینسان ئاگای لە خۆی بێ، هیچ هاندەرێکی ماددیی و مەعنەویی نەبێ، جگە لە خوا نزیك بوونەوە و لەلای خوا خۆشەویست بوون و وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا، ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان نییەتەکەی ئاوا دەبێ، بۆی دەبێتە داینەمۆیەك کە هەمیشە خوای پەروەردگار زیاتر هیدایەتی بدات، دەستی بگرێ چونکە خوا دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: [کەسانێ کە لە پێناو ڕەزامەندیی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە، بەڕاستیی ڕێنموونییان دەکەین، بۆ ڕێبازەکانی خۆمان و، بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاران دایە].

باشترین چاکەش کە بیکەیت ئەوەیە کە بە ئیخلاس و بە ساغیی، خوای پەروەردگار بپەرستی.

ئەوە ئامۆژگاریی منە، تا بۆت دەكرێ كار لەسەر دڵ و دەروونی خۆت بكە، لەسەر نییەت و هاندەر و پاڵنەرت بۆ هەر كارێك كە دەیكەی، وەك خواپەرستیی، بەڵكو با عادەتەكانیش نییەتی لە خوا نزیك بوونەوەیان لە پشتەوە بێ، ئنجا ئەوانیش دەبنە عیبادەت. بۆ وێنە: ئینسان تەوقە لەگەڵ كەسێكدا دەكا، لەگەڵ كەسێكدا ڕووخۆش دەبێ و قسەی خۆش دەبێ، ڕێزی دەگرێ، هاوكاری كەسێك دەكات، مادام هاندەر و پاڵنەرەكەی ئەوەیە كە لە خوا نزیك ببێتەوە، ئەویش دەبێتە عیبادەت، ئەگەرنا زانایان دەڵێن "عیبادەتەكانیش ئەگەر نییەتیان لەگەڵدا نەبێت، ئەو پاڵنەر و هاندەرە بەو شێوەیە نەبێت كە پێیان لە خوا نزیك ببیەوە، عیبادەتەكانیش دەبنەوە عادەت، بەڵام عادەتەكانی ئەگەر ئەو نییەت و ڕووحەیان تێدابێت، ئەو جەوهەر و كاكڵەیان تێدابێت، ئەوانیش دەبنە عیبادەت".

**(٣)** سێیەم شت كە بۆت باس بكەم، ئەوەیە كە ئەم گەردوونە هەمووی بەسەر و خواریەوە، واتە بە ئاسمانەكان و زەوییەوە، بەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، هەمووی بۆ حیكمەتێك ڕەخسێندراون، بەپێی زانیاریی ئێمە، هەڵبەتە ئەوەی بۆ زانیاریی ئێمە دیارە ئەوەیە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار لەلای خۆی لەوانەیە چەندان حیكمەتی دیكەی لەوەدا هەبێ، بەڵام ئەوەی

کە بۆ ئێمە دیارە، ئەو حیکمەتەیە کە هەموو گەردوون بەسەر و خوار، بە پێکهاتەکانیەوە، بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤ دروستکراوە، ئەویش لەو ئایەتە موبارەکەدا کە لە سوورەتی (الجاثية)دایە، خراوەتەڕوو، خوای زاناو توانا دەفەرمووێ:

﴿وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ الجاثية.

واتە: [خوا ئاسمانەکان و زەوی بە حەق هێناونەتەدی و، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی ئەوەی کە کردوویەتی، سزا یان پاداشتی بداتە و بەبێ ئەوەی ستەمیان لێبکرێ].

ئەم گەردوونە بەسەر و خواریەوە، تاقیگەیەکە بۆ مرۆڤ، زانینی ئەم ڕاستییە مەزنەش وا لە ئینسان دەکا، کە زۆر بەهەستیارییەوە بژی و مامەڵە بکات، بە زۆر وریایی تەمەنی خۆی بەرێبکات، نەك هەر خۆی لە گوناح و تاوان بپارێزێت، بەڵکو خۆی لە قسەی پووچ و کردار و ئاکاری پووچیش بپارێزێت. هەر بۆیە خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمووێت:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾﴾ المؤمنون.

واتە: [بەڕاستیی سەرفرازن و بەختەوەرن، ئەو بڕوادارانەی کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن و پشتیان کردۆتە (لغو) قسەو

ڕەفتاری پووچ].

ئەوە زۆر زۆر گرنگە ئینسان بەو هەستەوە، بەو ئامانجەوە بژیەت، کە ئەو حیکمەتەی خوا ئێمەی بۆ دروست کردووە، بیهێنینە دی، کە بریتییە لەوەی کە سەربەرزانە لەو تاقیکردنەوەیە دەربچین، سەربازانە لێی دەرچین، بەوەش سەربەرزانە لێی دەردەچین، کە ئێمە لەوەندە ژیانەدا کە دەژین، بیسەلمێنین: کە خوای پەروەردگارمان لە هەموو کەس و شتێك لەلا خۆشەویستتربووە، لەلا بەرز و بەڕێزتربووە، لەلا گەورەتربووە، بۆی ملکەچتربووین، لە هەموو کەس و لە هەموو شتێك، پتر پشتمان پێبەستووە و، ڕوومان تێکردووە و، بە پاکمانگرتووە، کە ئەوەش بریتییە لە بەندایەتیی کردن بۆ خوای پەروەردگار:

وەك دەفەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ الذاریات.

یانی: [من جند و مرۆڤم تەنها بۆ ئەوە دروست کردوون کە بمپەرستن].

چونکە بەو پەرستن و بەندایەتیی کردنەی جند و ئینسان بۆ خوا، لە تاقیکرنەوەی خوا دەردەچن، بەمەش ئەو حیکمەتەی کە ئەوانی بۆ هێناونە دی، دێتەدی.

**(٤)** چوارم شت کە بە دڵمدا دێ بۆت باس بکەم، ئەوەیە کە ئینسان بەبێ دوودڵیی ئەو بەرنامەی خوا بۆی داناوە و ناردووە، دەبێ بەبێ دوودڵیی وەری بگرێ، دڵ لە دڵ نەدا، وەك ڕاستیی ڕەها تەماشای بکە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة وسلام) کە بانگی خەڵکەکەی خۆیانیان کردووە، گوتوویانە: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴾ هود:٢٨.

خوای پەروەردگاریش بە پێغەمبەر دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ ﴾ یوسف: ١٠٨.

ئەوە زۆر گرنگە کە ئینسان لەسەر بەڵگە و بەرچاوڕوونیی و بەدڵنیایی ئەو ژیانە دونیاییە بگوزەرێنێ، نەك دڵی قەلەق بێ، ئەوەش کاتێك دەبێ، کە ئینسان بەو شێوەیە تەماشای بوون و گەردوون و دەورووبەری بکات، کە وەحیی خوا فەرموویەتی، بووناسیی (Ontology)یەکی هەبێ کە لە وەحیی سەرچاوەی گرتبێ، ئنجا لێرەوە ئەگەر ئینسان شتەکانی چاککردەوە، تێڕوانینەکانی پاك بوون، تێڕوانینی ڕاست بوو، شتەکانی دی چاك دەبن، زۆر گرنگە ئینسان لەسەر بناغەیەکی ڕوون و بێ چەند و چوون هەڵسووکەوت بکات و، بەدڵنیاییەوە ڕێ بکات، نەك هەر لە ئەگەر و نەگەردا بێ، بۆیە خوای بێ وێنە هەمیشە کە باسی مەدحی بەندەکانی دەکات،

بە ئەهلی دڵنیایی (یقین) باسیان دەکا، بەڵام ئەوانی دیکە، بە گومان (ظن)، وەك دەفەرمووێ:

﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾ النجم: ٢٣.

واتە: [ئەوانە بەس شوێن گومان دەکەون وئەوەی نەفسیان ئارەزووی دەکات].

بەڵام بۆ ئیمانداران هەمیشە خوای تاك و پاك کە باسی ئیمان دەکا، باسی یەقین و دڵنیایی دەکا:

﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد.

زۆریش گرنگە ئینسان بە ئیمان و تاعەتی چاك، بگاتە حاڵەتی ئۆقرەیی و ئارامیی و ئۆخژن و بەرچاوڕوونیی.

**قسەی کۆتاییشم ئەوەیە:** ئێمە تاکە شتێك کە لە بەردەستماندا هەبێ و لێی دڵنیابین، کە ئەوە فەرمایشتی خوایە لە ئێستای ژیانی بەشەردا، بریتییە لە قورئان، وەك جاری دیکەش باسمان کردووە. بۆیە دەبێ ئینسان توانای زیاتری خۆی، تەمەنی زیاتری خۆی، کاتی زیاتری خۆی لەگەڵ قورئاندا بەکاربێنێ، کە ئەوەش مانای دووریی نییە لە ڕێباز و شوێنی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چونکە ئینسان کاتێك دەتوانێت باش لە قورئان بەهرەمەند بێ، کە بەشوێن پێی پێغەمبەردا هەنگاو بنێ و باش هەوبڵدات لە سیرە و ژیان و

هەڵسوكەوتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ورد بێتەوە، چونكە هەموو هەنگاو و هەڵوێست و هەنگاوەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بریتی بوون لە قورئان، یانی: ئەگەر بمانەوێ قورئان بە بەرجەستەكراویی، بە تەتبیقكراویی ببینین، دەبێ تەماشای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بكەین، هەروەها ئەگەر بمانەوێت ئیسلام وەك تیۆریی و (النظريي) و فیكر ببینین، دەبێ تەماشا قورئان بكەین، بەڵێ، ئەگەر بتەوێت ئەم قورئانە بە بەرجەستەكراویی ببینی دەبێ تەماشا پێغەمبەری خوا بكەی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١.

دایكمان عائیشەش (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی "كان خُلُقُه القُرآنَ"[١] (خُلُق) یانی ئاكار و ڕەوشت. واتە: [شێوەو هەڵسوكەوتی (پێغەمبەر لە ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتییدا) بریتی بوو لە قورئان].

---

١) أخرجه أحمد برقم: (٢٤٦٤٥).

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی یارمەتی زیاتری تۆش و هەر کەسێکی دیکەش بدات، پێش هەر هەمووشتان خۆم، کە هەرچی زیاترە لە قورئان تێبگەین و بە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاشنابین و شوێن ڕێبازەکەی و ڕێوشوێنەکەی بکەوین بە چاکیی، کە شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی، بریتییە لە تەتبیق کردنی ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.

وصلى الله على محمد
وعلى اله وصحبه اجمعين والحمد لله رب العالمين.




# مردن و کۆتایی ژیان

شەریف:

ژیانی ڕاستەقینە لە دوای مردنەوە دەستپێدەکات. ئەم ژیانی دونیایە تەنها سەرخەوێکی کورتە و، مردن ڕاچڵەکین و وەئاگاهاتنە، دوای مردن شتەکان دەبن بە ڕاستیی: مردن بۆ کەسێکی باش دەستپێکی ژیانێکی خۆشتر و باشترە، دەربازبوونیەتی لە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا و چاوەڕێی وەرگرتنەوەی پاداشتەکانی دەبێ. بۆ کەسی خراپیش، مردن کۆتایی بە هەموو خۆشییەکانی دونیای دێنێ و کۆمەڵە سزایەکی گورچکبڕ چاوەڕێی دەکەن و، خۆزگە بە مردن دەخوازێ، بەڵام لە دوای مردنی ژیانی دونیا، مردنێکی دیکە نامێنێ. زۆر گرنگە مرۆڤ بەردەوام یادی مردن بکاتەوە و خۆی بۆ قۆناغی دوای مردن ئامادە بکات، مەگەر کەس بەبێ خۆئامادەکردن گەشت و سەفەری بۆ دەکرێ؟

بابە گیان! پێم خۆشە ئەگەر زەحمەت نەبێ، وەك چۆن لە تەوەری یەکەمدا باسی حەقیقەتی ژیان و ئامانجی بوونی مرۆڤت بۆ کردووم لە ژیاندا، لێرەدا -کە تەوەری کۆتاییە- باسی ئەوە بکەی بۆچوونی جەنابت چییە سەبارەت بە مردن و، ئەو ئامادەکارییانە چین کە دەبێ بۆ مردن بیانکەین؟

بابم:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

کاك شەریف گیان!

ئەمشەو کە ٢١ی مانگی ١٢ی ساڵی ٢٠٢٠ی زایینییە، بەرامبەر ٦ی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٤٤٢ی کۆچیی، من لە هەولێرەوە جەنابیشت لە (نیوکاسڵ) لە بەریتانیا، ئەو بابەتەی کە پێشنیارت کردووە، باسی مردن و کۆتایی هاتنی ژیانی مرۆڤ، لە سێ تەوەردا بۆت باس دەکەم، بەڵام زۆر بەکورتیی:

**تەوەری یەکەم:** پێم خۆشە پێناسەیەکی مردنت بۆ بکەم، ئایا مردن بریتییە لە چی؟ زۆربەی خەڵك مردن وا پێناسە دەکەن

و وای تێدەگەن، کە بریتییە لە لەبەین چوونی ئینسان و کۆتایی پێهاتنی ژیانی مرۆڤ! بەڵام لە ڕاستییدا مردن بریتی نییە لە لەبەین چوونی ئینسان و کۆتایی پێ هاتنی ژیانی مرۆڤ، بەڵکو مردن بریتییە لە گواستنەوە: گواستنەوەی مرۆڤ لە ژیانی دونیاوە بۆ ژیانی بەرزەخ، دواییش لەوێشەوە بۆ قیامەت، مردن بریتی نییە لە کۆتایی پێ هاتنی ژیانی مرۆڤ بەڵکو مردن قۆناغێکە لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ، زانایان زۆر جوان پێناسەیان کردووە: (**الموت آخر منزل من منازل الحياة الدنيا وأول منزل من منازل الآخرة**) واتە: (مردن کۆتا مەنزڵگایە لە مەنزڵگا و قۆناغەکانی ژیانی دونیا و یەکەمین مەنزڵگاشە لە مەنزڵگاکانی ڕۆژی دوایی).

زانایان لەبارەی مردنەوە گوتوویانە: (من مات فقد قامت قيامته) واتە: (هەرکەسێك مرد، ئەوە قیامەتی ئەو هاتووە). چونکە ئینسان کاتێك کە دەمرێ، لە هەموو شتێکی خۆی حاڵیی دەبێت بە گشتیی و تێکڕایی. یەکێك بۆی هەیە بڵێ ئەدی لە قیامەتێ ئەو حیساب و کیتاب و لێپرسینەوە چۆنە؟ وەڵامەکەی هەر ئەوەیە: کاتێ ئینسان دەمرێ یانی کورتەیەك لە خۆی حاڵیی دەبێ، چی کردووە و، چۆنی کردووە و، سەرەنجامی چۆنە و، خوای پەروەردگار لەگەڵی چۆنە و، شوێن و مەزڵگای چۆنە؟ ئەوە وەك شتێکی کورت و پوخت، لە قەدەر

قۆناغی بەرزەخ، بەڵام دوایی کە قیامەت دادێ، بە تەفسیل لەو شتانە حاڵیی دەبێ و بەرچاوی ڕوون دەبێتەوە و، چاکەو خراپەی خۆی دێتەوە بەرچاو، کەواتە: مردن، وەك پێناسەکە دەڵێین: مردن بریتیە لە جیابوونەوەی ڕووح لە جەستە و بریتی نیە لە لەبەین چوون و، بریتی نییە لە کۆتایی پێ هاتنی مرۆڤ، بەڵکو تەواوکردنی قۆناغێکە لە قۆناغەکانی بوونی مرۆڤ، کە ژیانی دنیایە و دەست پێکردنی قۆناغێکە کە قۆناغی بەرزەخە، خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرمووێ:

﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٠٠﴾ المؤمنون.

واتە: (لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە).

خوای باڵادەست ژیانی بەرزەخی ناو ناوە (برزخ)، یانی: (حجاب، حاجز) پەردەو نێوان، کە درێژ دەبێتەوە تا ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، کەواتە: قۆناغی بەرزەخ، لەو کاتەوە دەسپێدەکات کە مرۆڤ دەمرێ و ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوە، درێژەش دەکێشێ تاکو ڕۆژی قیامەت، بۆیە دەتوانین بڵێین، بەرزەخ قۆناغێکی ڕاگوزەرە (مرحلة إنتقالية) و پەردەیەکە دەکەوێتە نێوان ژیانی دونیا و قیامەتەوە.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمووێت:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ المؤمنون.

باسی ئەوە دەكات، دەفەرمووێ: [هەتا یەكیان مردنی دەگاتە سەر (لە بێبڕوایان) دەڵێ: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە كردەوەی باش بكەم لەو كردەوە دونیاییانەی جێمهێشتوون، یاخود لەو كردەوەی چاكانەی كە وازملێهێناون بابچم بیانكەم، جارێكیكە تاقیمبكەنەوە و بمبنەوە بۆ ژیانی دونیا، خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێ: نەخێر، ئەوە قسەیەكە بەس خۆی دەیكات (واتە: كەس لێی نابیستێ و لێی وەرناگرێت، چونكە خوا هەموو شتێكی بە سیستم داناوە) قۆناغی ژیانی دونیا لەكاتی خۆیدایە و، دوای تەواوكردنی قۆناغی ژیانی دونیا بۆ هەموو تاكێك، كە مردنی بە دوادا بێ، قۆناغی بەرزەخ دەست پێدەكات، لە دوای بەرزەخیش ئەوجار قۆناغی قیامەتیش دەست پێ دەكات].

**تەوەری دووەم:** ئایا لەگەڵ مردندا چۆن مامەڵە بکەین؟

پێم خۆشە ئەم مەسەلەیەش تۆزێك تیشكی بخەینە سەر، لە ڕاستییدا مردن ئەوە گومانی تێدا نییە كە حاڵەتێكە و بەسەر هەموو كەسدا دێت، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ﴾ هەم لە سووڕەتی (الأنبياء)دا وایفەرمووە، هەم لە سووڕەتی (العنكبوت)دا، هەم لە سووڕەتی (آل عمران)دا وایفەرمووە. لەچەند شوێنێكدا ڕاستییەكی بەیان كردووە، كە هەموو نەفسێك چێژەری مردنە، لە ڕاستییدا ئەوە ڕووحەكەیە كە هەست بە ئازاری مەرگ دەكا، ڕووح كە لە جەستە جیا دەبێتەوە ئەو جەستەیەی كە هۆگری بووە و لەوێدا بووە، كە لێی جیا دەبێتەوە، هەست بە ئازار دەكات، مردن دەبێ وا تەماشای بكەی، كە ئەوە قەرزێكە هەر دەبێ بدرێتەوە، زۆر جاران لە سەرەخۆشییاندا دەڵێم: هەموومان یەكی مردنێك قەرزدارین، ئەو قەرزە هەر دەبێ بدرێتەوە، درەنگ یان زوو، مردن سەفەرە و ئەو سەفەرە هەر لەبەرە، دەبێ هەموو كەس بەو قۆناغەدا بڕوا، چونكە خوا ئێمەی داناوە لەم سەر زەوییە بۆ تاقیكردنەوە، ئنجا تاقیكردنەوەكە سەرەتایەكەی دیارە لە دایك دەبی، بەڵام كۆتاییەكەی دیار نییە كەی كۆتایی دێت، بەڵام هەموو كەس دڵنیایی هەیە لەو بارەوە كە دەزانێ دەمرێت و كۆتایی دێت،

بۆیە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێت) لە یەکێك لە قسە نەستەقەکانیدا دەڵێت "ما رأيت يقينا أشبه بالظن من الموت" دەڵێ: (هیچ یەقینێکم نەبینوە لە مردن زیاتر بە گومان بچێ). یانی: مردن یەقینییە، کەچی وەك گومان خەڵك مامەڵەی لەگەڵدا دەکات! کەواتە: بناغەی مامەڵەمان لەگەڵ مردندا، ئەوەیە کە ئەوە حەقیقەتێکە و قۆناغێکە، خوای پەروەردگار لەسەر هەموو مرۆڤەکان و لەسەر جندەکانیشی نووسیوە، کە دەبێ مردن بچێژن و دەبێ کاتێك بێ کە کۆتایی بە قۆناغی ژیانی دونیایان بێت کە قۆناغی تێدا تاقیکرانەوەیە. ناکرێت تاکو قیامەتێ هەر تاقی بکرێنەوە، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) ژیانەکەی وادانـاوە بە شەست ساڵ، حەفتا، هەشتا، نەوەد ساڵ، کەم وایە بچێتە سەرتر، لەو دەورەبەرەدا هەموو کەسێك کۆتایی بە ژیانی دێ.

## تەوەری سێیەم: ئێمە چۆن خۆمان بۆ مردن ئامادە بکەین؟

لە ڕاستییدا خۆئامادەکردن بۆ مردن، ئێمە نازانین کەی دەمرین، بەڵام خۆئامادەکردن بۆ مردن ئەوەیە، بزانین چۆن دەژین، بەڵام لە کوێ دەمری و چۆن دەمری و بەچی دەمری؟ ئەوە بەس خوا دەیزانێ، بەڵام ئینسان دەتوانێ دیارییبکا چۆن

دەژی، چۆنییەتیی ژیانەکەت بەدەست تۆیە، بەڵام کەی دەمری و لەکوێ دەمری و چۆن دەمری؟ ئەوە بەدەستی خوای پەروەردگارە، وەك خوای بەرزی مەزن دەفەرمووێ:

﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾﴾ لقمان.

واتە: [هیچ کەس نازانێ بەیانی چی دەکا و، هیچ کەسیش نازانێ لە چ سەر زەمینێك دەمرێ، بێگومان خوا زانای شارەزایە].

ئەوە بەگشتیی وایە، ئنجا خۆئامادەکردن بۆ مردن، ئەوەیە ئینسان ئاگای لە ژیانەکەی بێت، فەرمایشتێکی پێغەمبەر هەیە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەچەند ڕیوایەتێك هاتووە یەکێکیان لە ڕیوایەتەکانی ئەوەیە دەفەرمووێت:

(لا تَزُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَدَمَا عَبْدٍ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَ أَفْنَاهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ عَمِلَ فِيهِ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ)[١]

واتە: [هیچ کەسێك دوو پێی بەملاولادا ناچن لە ڕۆژی دواییدا، هەتا پرسیاری لێ نەکرێت لەو پێنج شتانە: (١) تەمەنی لە چیدا بەڕێ کردووە؟ (٢) جەستەی لە چیدا پیری کردووەو

١) أخرجه الترمذي ٢٤١٧ وصححه الألباني.

بەکـاری هێنـاوە؟ (٣) زانسـتەکەی چەنـدەی کـار پێکـردووە؟ (٤)ماڵ و سامانەکەی دوو پرسیاری لێ دەکرێ: یەکەم، چۆنی پەیـدا کـردووە؟ (٥)دەم یـاخود دووەم، مـاڵەکەی چـۆن سـەرف کردووە؟].

ئنجا عاقڵ ئەو کەسەیە کە وەڵام بۆ هەمـوو ئەو پرسیارانە ئامادە بکات: تەمەنەکەت لە چیدا بەڕێکردووە؟ جەستەکەت لە چیدا بەکارهێناوە؟ ئەوەی کە دەیزانی ئەو زانیـاریی و تێگەیشتن و شارەزاییەی کە خوا فێری کـردووی، چەندەت کـار پێکـردووە؟ هەم لە زاتی خۆتـدا هەم لە دەرووبەرتـدا. پاشان مـاڵ و سامانێك کە هاتۆتە دەستت چۆنت پەیدا کردووەو دواییش چۆنت خەرج و سـەرف کـردووە؟ ئـاخر ئینسـان ئەگەر مـاڵ بە حەڵاڵـی پەیـدا بکـات، بە حەڵاڵـیش جـێ بەجێـی دەکـا، لە کـاری باشیشـدا بەکاری دێنێ.

شێخ عەبـدولقادری گەیلانیـی (ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ) لە کتێبـی: (الفـتح الربـاني والفـيض الرحمـاني)دا کە لە چەنـد مەجلیسێك پێکدێ، خەڵکی بەغـدا دەدوێنـێ کـاتی خۆی، پێیـان دەڵـێ: "ئەی ئەهلـی بەغـدا! وامەزانـن عەبـدولقادر نـازانێ ماڵەکەتـان چۆن پەیـدا دەکەن، دوایـی دەڵـێ مـن ئیـددیعای ئەوە ناکەم عیلمی غەیبم هەیە و زانیاریی پەنهـانم هەیە، بەڵام دەزانـم چۆنی پەیدا دەکەن دەشزانم ئـاوای سەڕف دەکەن، تەماشا دەکەم

چۆنی خەرج دەکەن، دەزانم ئاواشتان پەیدا کردووە، ئەگەر لە حەڵاڵدا خەرجی بکەن، دیارە بەحەڵاڵییش پەیداتان کردووە".

هەرواشە: ئەوانەی پارە بە گەندەڵیی و پۆخەڵیی پەیدا دەکەن، وەك ئەو حوکمڕانە ملیاردلێرانە و ئەو دەوڵەمەندانەی شەریکە دزانە لەگەڵیان شەریکن، پارەی ئەم وڵاتە بە گەندەڵیی دەخۆن، موقەددەراتی ئەو خەڵکەیان خستۆتە دەستی خۆیان، نەوتە دەیفرۆشن، غازە دەیفرۆشن، باج و خەراج و گومرگ و ئەوەی نێوخۆیە کۆی دەکەنەوە و ئامادە نین بیکەنە مووچە بۆ ئەو خەڵکە!

بەهەرحاڵ عاقڵ ئەو کەسەیە کە وەڵامی ئەو پرسیارانە هەموویان ئامادە بکات، ئنجا ئا ئەوە چۆنیەتیی خۆئامادەکردنی عاقڵانەیە بۆ مردن، کە ئینسان بزانێ چۆن دەژی؟ وەك گوتم، ئەرکەکانی خوای پەروەردگار کە لەسەر شانیەتی چۆنیان جێبەجێ دەکا؟ ئەرکی خەڵك کە لە سەریەتی، ئەگەر پەیوەندیی خزمایەتییە، ئەگەر حەقی دۆستایەتییە، ئەگەر حەقی هاوسەردارییە، ئەگەر لەگەڵ باب و دایکە، لەگەڵ دۆست و خزمە، لەگەڵ دراوسێیە، چۆن حەقیان بۆ جێبەجێ دەکا؟ بەنسبەت باب و دایکەوە لەگەڵ منداڵی خۆیان، یانی حەقی خاوەن حەقەکان چۆن جێبەجێ دەکا و چۆن دەژیەت و تەمەنەکەی لە چیدا بەڕێ دەکا؟ چۆنیەتیی خۆئامادەکردن بۆ

مـردن ئەوەیە، كە وەك گـوتم: بەشێوەیەك بژی ژیـانێكی پـاك و چاك و ڕاست، وابكەی كە عەیبداری لای خەڵك و گوناحباری لای خوا نەبی، وە ئەركەكانی سەرشانی خۆت بەرامبەر بە خوا (سبحانه وتعالی)، ئەوجار بەرامبەر بە خەڵك جێبەجێ بكەی، ئەوكاتە هەركاتێ مردن بگاتە سەرت، مادام دەستت پڕبێ و توێشووی چاكت پێ بێ و خۆتت بۆ ئامادەكردبێ و بە ژیانێكی پاك و چاك و ڕاست و ڕێكەوە ژیابی، وابی عەیبداری لای خەڵك و گوناحباری لای خوا پەروەردگار نەبی، بەو حاڵەوە هەركاتێ مردن بگاتە سەرت، مەرحەبای لێ دەكەی و پێشوازیی لێ دەكەی و ناخەجلێی و ناشلەژێی، چونكە وەك حەدیسی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: {مَنْ ماتَ على شيءٍ بَعثَهُ اللهُ عليهِ}[1] واتە: [هەركەسە لەسەر چی بژی لەسەر ئەوە دەمرێ و، لەسەر چیش بمرێ، لەسەر ئەوەش زیندوو دەبێتەوە].

ئنجا ئەگەر تەمەنمان بەژیانێكی مسوڵمانانە بەرێكەین، دیارە مردنێكی ئیماندارانەش دەمرین، ئەوكاتیش دیارە لەژێر بەیداغ و عەلەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زیندوو دەكرێینە و بەسەر بەرزی دەچینەوە خزمەت خوای پەروەردگار و، بە دیداری

١) أخرجه أحمد برقم (١٤٤١٣)، وأبو يعلى برقم ( ٢٢٦٩)، والحاكم برقم (٧٨٧٢) وقال: صحيح الإسناد على شرط مسلم.

پێغەمـبەری پێشـەوامان شـاد دەبیـنەوە و، خـوا پشـتیوان بـێ لە خــزمەت پێغەمـــبەری خـــوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەچیـــنە باخەکــانی بەهەشــت، بــاخە پــڕ نــاز و نیعمەتەکــانی خــوای پەروەردگار و، بە دیداری خواو بە ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار شاد دەبین. خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە دەزانـن چۆن بژین و، دەزانــن تەمەنەکەیــان و ژیانەکەیــان چـۆن بەڕێ دەکەن و، سـەرەنجام مردنێکـی ئیمانــدارانە و سـەربەرزانە دەمـرن. محمـد ئیقبـاڵی شـاعیرو فەیلەسووفی نـاوداری مسـوڵمانی پاکسـتانیی دەڵێ: "نیشانە مـرد مؤمن با توگـویم، کە چۆن مـرگش رسید خنـدان بمیـرد" یـانی: (با نیشـانەی پیـاوی موسـوڵمانت پێ بڵێم، ئەوەیە کە بە زەردەخەنەوە بمـرێ). ئینسـانی ئیمانـدار لە مردنـێ ناترسێ و خۆی بۆ ئامـادە کـردووە و، دەزانـێ مـردن بـریتییە لە بەجێهێشـتنی ژیـانی دنیـا و ڕۆیشـتن بەرەو قۆنـاغی بەرزەخ و، میــوان بــوونی خــوای پەروەردگــار، بـۆیە بە دڵێکـی ئاسـوودە و مورتاحەوە ئەو سەفەرەی دەکات. خوا لەو کەسانەمان بگێڕێت.

ئەمەش ئامۆژگاریی ئەمشەوم بوو کـاکە شـەریف گیـان! لە هـی شـەوانی دیـکە درێژتـر بـوو، خـوا پشـتیوان بێ بەهـرەی لـێ وەربگـــری، خـــۆت و ئەوانەی گوێبیســـتی دەبـــن، یـــاخود وەکـــو خوێندنەوە دەیخوێننەوە.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# نێوەڕۆك

# گفتوگۆیەك لەگەڵ بابمدا

خوێنەری سەنگین!

ئەم کتێبەی بەردەستت کۆکراوەی (٢٥) باسو خواسو گفتووگۆی جیاوازن، لەسەر هەر بابەتێك بەپوختی بۆچوونی خۆم نووسیوە. هەروەرها بۆ دەوڵەمەندکردنی باسەکان پرسیارم لە جەنابی بابم کردووە، کۆی باسەکان بابەتی ڕووحیی‌و فیکریین دەربارەی ژیان، بۆ وێنە باسی: خوێندنەوە، پەیوەندیی نێوان ئافرەت‌و پیاو، خۆشەویستیی‌و هاوسەرگیریی، زیکرو یادی خوا، کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، مردن‌و کۆتایی ژیان..هتد.

ڕیزبەندیی بابەتەکان وادانراوە لە سەرەتای ژیان دەست پێدەکات‌و بە مردن کۆتایی پێدێت.




6000 IQD

COVER DESIGN

